


ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: سێوی سێهەم
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: وتار و چاوپێکەوتن
نۆبەتی چاپ: سێهەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٨٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٢٢٧)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-965-0



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

پێشکەشە بە شێرزاد حەسەن
کە پێش هەمووومان دونیای بەجۆرێکی دی بینی

# پێڕست

# سەرەتایەك

یەکێک لە کێشە گەورەکانی دونیای ئەمڕۆ ئەوەیە کە ئەو سیستەمە سیاسی و ئابوورییەی دونیا دەبات بەڕێوە، وەک ئەبەدی و نەگۆڕ دەردەکەوێت. وەک سیستەمێک کە کۆتایی نەبێت و هێزی نوێبوونەوە و هەستانەوەی لە هەموو قەیرانێک وەها بێپایان و گەورەبێت کە چیدی لەگەڵیدا نەتوانین خەونی گەورە ببینین. دیارە هەرەسی تیۆرییە کلاسیکییەکانی شۆڕش و دابەزینیان بۆ پێکهێنان و دروستکردنی سیستەمی ستەمکار و دژەمرۆڤ، هۆیەکی گەورەی مردنی ئەو هیوایانە بوو کە مرۆڤایەتی لەسەدەی نۆزدە یاخود سەرەتاکانی سەدەی بیستدا بە وشەگەلی وەک شۆڕش و لابەلابوونەوە و گۆڕان هەیبوو. بە جۆرێک ئەمڕۆ گەڕانەوە بۆ ئەو وشانە سەیر و نامۆ و زۆرجار نادروستیش دەردەکەون... وەک ئەوەی خودی ئەم وشانە هەمیشە بەرەو ستەممان بەرنەوە. لێرەوە خواستی پشت هەر سێ وتارە بنەڕەتییەکەی ئەم کتێبە لە جەوهەردا گەڕانە بۆ وەڵامی یەک پرسیار: ئایا سیستەمێک هەیە ئەبەدی بێت؟ ئاخۆ سیستەمێک هەیە بەجۆرێک داخراو و بێدەروازە بێت، هیچ ڕێگا و دەربازێک نەبێت بۆ دەرچوون لە گەمارۆ ئاسنینەکەی؟ ئاخۆ سیستەمێک هەیە بەجۆرێک تەواو و بێخەوش و بێناکۆکی بێت، بتوانێت لە ناوەوە تووشی ململانێ نەبێت؟. دیارە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە مرۆڤ کۆمەڵێک ڕێگای جیاوازی لە پێشدەمدایە، دەتوانێت وەک

فۆکۆیاما بڵێت کە سیستمی دونیای ئەمڕۆ کۆتایی مێژووە و بڵندترین ئاستی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییە کە ناکرێت ئەلتەرناتیڤێکی گەورەی بۆ بدۆزرێتەوە... دەشکرێت وەک چەپە تەقلیدییەکان بگەڕێتەوە سەر تیورییە کلاسیکییەکان و بڵێت کە هەرەسی ئەم سیستمە بە چەکوشی چینێکی شۆڕشگێڕ حەتمییە و ئەوەی ئێستا پێویستمانە پارتێکی شۆڕشگێڕە کە سەرکردایەتی بزاڤی ڕوخانی سیستەم بگرێتە دەست. یان دەکرێت کارەکە سادەتر بکەینەوە و بگەڕێینەوە بۆ دیالەکتیکی مارکسی و بڵێین هەرەسی کەپیتالیزم حەتمییە و ئێمە ئەوەمان لەسەرە چاوەڕوانی ساتی پێگەیشتنی هەلومەرجی بابەتی بین بۆ سەرهەڵدان و دەرکەوتنی خۆری ئەو حەتمییەتە. ئەم دوو بۆچوونە بەبڕوای من گەرچی زۆر دژن، بەڵام دوو دیوی یەک دیاردەن، یەکێکیان گرەو لەسەر سیستمێکی نەگۆڕ دەکات، ئەویدیان گرەو لەسەر تیورەیەکی نەگۆڕی شۆڕش دەکات. لە ڕاستیدا شۆڕشگێڕێکی نەگۆڕ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کۆنزەرڤاتیڤێکی نەگۆڕدا نییە. ئەم کتێبە هەر لەسەرەتاوە ئەم دوو تێزەیە دەخاتە لاوە... هەڵگرانی ئەم دوو عەقڵییەتە چاکترە یەک لەگەڵ یەکدا دیالۆگی بێزەنتی خۆیان درێژە پێبدەن. من لێرەدا ڕێگایەکی کەمێک جیاوازتر و کەمێک قورستریش دەگرم... لە هەر سێ وتارەکەدا مەبەستمە بۆ ئەو ئاسەوار و تێز و ڕوانینە فەلسەفیانە بگەڕێم کە دەشێت بەرەو دەرەوەی سیستممان ببەن و لە گەمارۆی ئێستا و ئێرە و لە جەبری «ئەوەی هەیە» دەرمانبکەن. ئەم کتێبە لە هەر سێ وتارەکەیدا هەوڵە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو دەلاقە گەورەیەی لە ناو هەموو سیستمێکدا هەیە و ڕێگا لەوە دەگرێت سیستم ببێتە شتێکی جێگیر و ئەبەدی و داخراو. لە هەر سێ وتارەکەدا سەروکارم لەگەڵ فەلسەفە و کۆمەڵناسی و دەروونناسی نوێدایە، لە هەرسێ بەشەکەدا دوای هێڵێک دەکەوم کە لەسەر دژایەتی و بەرەنگاری «میتافیزیکای کەماڵ» ئیشدەکات... لە

بەشی یەکەمدا، بەدوای ئاسەواری ئەو هەنگاوانەدا دەڕۆم کە دەشێت لە فەلسەفەکانی بلۆخ و جۆن هالۆوەی و دیریدا و ژیژیکدا بەرەو دەرەوەی سیستممان ببەن. لە وتاری دووەمیشدا باس لەو ئەگەرە سێهەمە دەکەم کە لە کرداری هەڵبژاردن و بڕیاردانی فەردی و کۆمەڵایەتیدا هەیە و هەمیشەش دەمێنێتەوە، سێوی سێهەم مەجازێکە بۆ ئەو هەلومەرجەی لە هەناوی کۆمەڵگادا بوار بۆ دەرکەوتنی ئەگەری نوێ سازدەکات. لە بەشی سێهەمیشدا لەلای لاکان بۆ ئەو ڕەگەزانە دەگەڕێم کە دەشێت لە پێکهاتی دەرونیدا خزمەت بە ڕۆحی ڕام نەبوون و دەستەمۆنەبوونی مرۆڤ بکەن. هەوڵمداوە ئەم کتێبە وەک دەروازەیەکی گشتیش وەها بێت بۆ ناساندنی کۆمەڵێک چەمک و زاراوە کە شوێنێکی گرنگیان لە سیستمی بیرکردنەوەی هاوچەرخدا هەیە. بە گشتی ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ دروستکردنی گومان دەرهەق بە هەر سیستمێک کە خۆی وەک جاوید و نەگۆڕ وێنابکات، بەڵام ئاشکراشە دروستکردنی ئەم گومانە لە ئاستی فەلسەفیدا کارێکی قورسە و بەرەو ڕیزێک تەوەری گرنگی دیمان دەبات کە ناتوانین خۆمانی لێلابدەین، وەک کێشەی سوبێکت لە فەلسەفە و مانای گووتار و گرفتی ئەنتاگۆنیزم و کێشەی مەحاڵ لە فیکری هاوچەرخدا. بیرکردنەوە لە گۆڕینی سیستەم لە جەوهەردا جودا نییە لە بیرکردنەوە لە شوێنی سوبێکت و سروشتی کۆمەڵگا و دۆخی ئەنتۆلۆژی مرۆڤ وەک مەخلوقێکی وێڵگەرد لە نێوان دیار و نادیاردا. بۆیە ئەم کێشانە لە زۆربەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا دەردەکەون و شوێنی گرنگیان لە هەر سێ باسەکەدا هەیە.

دیارە پێشتر بڕیار بوو دوو توێی ئەم کتێبە هەندێک وتاری دیکەش لە خۆبگرێت بە تایبەت وتاری «دیسپۆتیزم، غەیبانییەت، سیاسەت» کە پێشتر بەشێکی لە ڕۆژنامەدا بڵاوبۆتەوە. بەڵام بڵاوکردنەوەی ئەو وتارانەش بەجۆرێک قەوارەی کتێبەکەی گەورەدەکرد و تێچوونی

کتێبەکەی بەرزدەکردەوە لەگەڵ خواستی ئێمەدا نەدەگونجا. لەبەرئەوە بە ناچاری دەستبەرداری ئەو بیرۆکەیە بووین و کتێبەکەمان تەنیا لەم بابەتانە دروستکرد کە ئاماژەمان پێدا. بەو چەشنەش کتێبەکە سێ وتار و چاوپێکەوتنێک لە خۆدەگرێت کە پێشتر لە هیچ جێگایەکدا بڵاونەکراونەتەوە.

# ئایا دەکرێت ڕووبەڕووی سیستم بوەستینەوە و تێیپەڕێنین؟

«نیگایەک لە بنەما فەلسەفییەکان»

لە یەکێک لە وتارەکانی پێشوومدا، ڕۆحییەتی گۆڕانم وەک ئەو ئامادەگییە گشتییە وەسفکرد کە لە هەناوی مێژوو و هەناوی کۆمەڵگادا هەیە بۆ تێپەڕاندنی خۆی. لێرەدا دەربارەی ڕۆحییەتێکی بەهێزتر و کاراتر و دەمامکدارتر قسەدەکەم کە ڕۆحییەتی سیستمە، ئایا بەڕاستی دەکرێت دژ بە ڕۆحییەتی سیستم بوەستینەوە و تێیپەڕێنین؟.

ڕۆحییەتی سیستم تەواوی ئەو میکانیزمانەیە کە لە خەیاڵی فەردی و گشتی، لە تێڕوانینی نوسراو و گووتراودان و بەجۆرێک لە جۆرەکان سیستم بەرهەمدەهێننەوە. ئەو توانا گەورەیەی سیستمە لەسەر گێڕانەوەی ڕەگەزە دژەکان بۆ ناو خۆی، توانایەتی لەسەر خۆ دروستکردنەوە، توانایەتی لەسەر وەستاندن و بێبەهاکردنی تێپەڕاندن، دژایەتیکردنی ڕاستەوخۆ و دەمامکدارانەی هەر بزاوتێکە بەرەو دەرچوون لە سنووری خۆی بجوڵێت. توانای سیستمە لەسەر پەکخستنی «ئەنتی تێز»، واتە کوشتن و سڕینەوەی هەر پرۆسەیەکی ناوەکی نەفیکردنە کە سیستم بخاتە بەردەم ئەلتەرناتیڤی ڕاستەقینەوە، هەوڵێکی گەورەیە بۆ دروستکردنی لێکچوونێکی ژێرەوانکێ و ناوەکی لە نێوان هەموو دژەکاندا، سڕینەوەی هەر جۆرە ڕەمزییەتێکی جیاکارییە کە لە واقیعدا دروستبووبێت و خۆی وەک ئەنتی

سیستم پێناسەبکات، واتە تێکەڵاوکردنی شتەکانە بە چەشنێک نەکرێت لە نێوان سیستم و دژەکانیدا جیاوازییەک ببینین.

سەرەتا دەبێت بڵێم قسەی من لە ڕۆحییەتی سیستم باسکردن نییە لە جەوهەرێکی نەگۆڕ، بەڵکو باس لە خاڵێکی بەرگری ناوەکی دەکەم کە لە ناو سیستمدایە، وەک چۆن «ڕۆحییەتی گۆڕان» خاڵێکی سەرەتای هەیە، نوێنەری ئەگەری گۆڕانە بێئەوەی هیچ فۆرمێکی وەرگرتبێت، بێئەوەی گووتارێکی کۆنکرێت یاخود شێوەیەکی پێشوەختی ئەو خەونەی لا دروستبووبێت کە دەشێت بەرهەمیبهێنێت، پنتێکی گریمانەییە کە زۆر جار «سلافۆ ژیژیک» ئەم پنتە بە شەبەق یان دەلاقەی ناو سیستم ناودەبات. « ڕۆحییەتی سیستمەیش» بەپێچەوانەوە، پنتێکی گریمانەییە نوێنەرایەتی سەنتەرێک و چەقبەستنێکی ناوەکی ناو سیستم دەکات. گەر زۆر سادە و گشتی بدوێم، دەڵێم لێرەدا باس لە ململانێیەکی ناوەکی بەڵام گریمانەیی ناو هەموو سیستمێک دەکەم، لە نێوان دوو پنتدا یەکێکیان ناو دەنێم «ڕۆحی گۆڕان» کە تەواو لە ناوەوە بەرە لادان و دەرچوون لە دەسەڵاتی سیستم و شکاندنی چێوەکانی دەڕوات، واتە ئەو بەشەیە کە سیستم ناتوانێت بیخاتە ناو خۆیەوە و لە ناکۆکییەکی هەمیشەییدا لەگەڵ سیستمدا دەمێنێتەوە و دەربڕی ڕۆحی نەگونجانێکی هەمیشەییە «بۆ نمونە : ژیژک نەستی فرۆیدی وەک ئەو نەگونجانە هەمیشەییە لەگەڵ دونیا دا دەخوێنێتەوە». ئەم ململانێیە لەگەڵ پنتێکی دیکەدا ڕوودەدات کە دەیەوێت سیستم لە هەر گۆڕانکارییەک بپارێزێت و من لێرەدا بە «ڕوحییەتی سیستم» ناویدەبەم. ڕۆحییەتی سیستم ئەو بەشەی سیستمە کە هەموو شێوازێکی دەرچوون لە سیستم بەتاڵدەکاتەوە، ئەگەری دەرچوون لە سیستم دەکاتە ئەگەرێکی مردوو، تەواوی شتەکان وا وێنادەکات وەک ئەوەی هەمیشە لە ناو دیوارەکانی سیستمدابن، زۆرجار وا خۆی پیشاندەدات کە تەماحی لە

گۆڕانی ڕادیکالترە، بەڵام لە جەوهەردا، لە نەستدا، لە مانای ئیشکردندا، ناهێڵێت درزە ڕاستەقینەکانی سیستم گەورەببن، واتە هەموو نەفیکردن و درز و ئەگەرێکی شکاندنی سیستم دادەخات. ڕۆحییەتی سیستم لەگەڵ ڕۆحییەتی گۆڕاندا لە قووڵایی سیستمدا هەمیشە لە بەریەککەوتندان... بوونی ئەم دوو پنتە، وەک ئەو هێزە ناوەکییە وەهایە کە لە یەککاتدا ناهێڵێت سیستم تەواو لەیەک هەڵبوەشێت و ناشهێڵێت تەواو بوەستێت، لاوازبوونی هەر یەکێک لەم دوو هێزە لەسەر حیسابی پەککەوتن و مردنی ئەویتریان دەرەنجامی ترسناکی هەیە... بەڵام بوونی ئەم دوو هێزە بە بڕوای من مەرجی گۆڕان و جیاوازی نێوان شتەکانە... ئەمەیە وادەکات کە «جیاوازی» «لێکترازان» «پێکەوەنەگونجان» دۆخی ناوەکی کۆی شتەکان بێت، بێئەوەی ژیان بکەوێتە ناو ناڕێکییەکی گەورە و مرۆڤ لە فەوزای جیاوازییەکاندا ونببێت.

دەتوانین هەر لەم ڕوانگەیەوە ململانێی قووڵی نێوان میتافیزیک و پۆست مۆدێرن و ترازانسازیش «تفکیکیة» ببینین، لە ئێستاشدا لە فیکری فەیلەسوفێکی گرنگی وەک ژیژیک تێبگەین. بەبێ باوەڕ بە بوونی درزێکی بنەڕەتی، ناتوانین لە ڕەتکردنەوەی «لێکترازانسازی» بۆ هەر جەوهەرێک، سەنتەرێک، ناوەندێکی جێگر یان سوبێکتێک تێبگەین. فەلسەفەی میتافیزیک هەوڵێکی گەورەیە بۆ گەیشتن بە خاڵێکی جێگیر، بە جەوهەرێک، بەشوێنێک کەرتبوون و دابەشبوون تیایدا دەمرێت، واتە درز و دەلاقە و شەبەقەکان تیایدا دەمرن. فەلسەفەی نوێش لە زۆر ڕوویدا لایەنی کەم لای فرۆید و چەمکی نەست، لای لاکان و بوونی «بابەتی ئەلفی بچوک» «کە چەمکێکی سەرەکی ژاک لاکانە و ئاماژەیە بۆ ئەو بابەتە ونە سەرەکییەی ناو سیستمی دەرونی کە لیبدۆ و ئارەزووەکانی ئاڕاستە دەکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا بابەتێکی ونە و هەرگیز نادۆزرێتەوە، لێرەوە ئارەزوو هەرگیز تێرنابێت، چونکە گەیشتن بە بابەتی ئەلفی بچوک

مەحاڵـە»، تـا دەگەیـنـە دێریـدا و سـەیرکردنی بـۆ سـوبێکت وەک شـتێکی بێسـەنتەر، وەک نایەکەیـەک، وەک کەرتبوونێـک. تـا ژیژیـک و گرێدانەوەکانـی بـۆ چەمکـی «کۆجیتـۆی دیکارتـی، بـە چەمکـی سـوبێکتی لاکانـی» «هەوڵـی بـۆ تێپەڕاندنـی پۆسـتمۆدێرنە، لـە ڕێـگای زیندووکردنـەوەی چەمکـی «تاراندنـی تارانـدن ـ نەفـی نەفـی» هیگڵـی» و ڕەخنـەی لـە چەمکـی دەسـەڵاتی «فۆکۆیـی» «کەلـەم وتـارەدا کەمێـک لەسـەری دەوەسـتین». بـە کۆ ئەمانـە نیشـانەن لەسـەر بوونـی دەلاقەیەکـی پڕنەکـراوە، لەسـەر پنتێکـی تێکـدەر کـە ناچێتـە ژێـر ڕکێفـی سیسـتمەوە، پنتێکـی هەمیشـە یاخـی کـە کۆناکرێتـەوە و ناچێتـەوە نێـو ڕیزبەندییـەوە.

بەکورتـی هەوڵـدان بـۆ هێشـتنەوەی گووتـار و ئیدیـا و بەریانـە جیاوازەکان لـە نـاو سیسـتمدا، ڕێگریکـردن لـەو هێزانـەی کـە دەشـێت زیاتـر و زیاتـر درزەکانـی نـاو سیسـتم گەورەبکـەن، ئەرکی ڕۆحییەتی سیسـتمە... ڕۆحییەتی سیسـتم نەفیکردنـی درزەکان نییـە، بەڵکـو داننەنانـە بـە درزەکانـدا. درزەکان هـەن، واتـە هـەم ئەنتۆلۆژیـن و هـەم مێژوویـن، هـەم لـە نـاو سـوبێکت و هـەم لـە نـاو میکانیزمەکانـی جوڵاندنـەوەی دونیـادان، ئـەوەی کـە ڕۆحییەتـی سیسـتم دەیـکات لادانـی درزەکان نییـە، بەڵکـو ڕێگرتنـە لـە گەورەبـوون و دەرکەوتنیـان، شـاردنەوە و داپۆشـینیانە. سیسـتم بۆئـەوەی بتوانێـت ئـەو کارەبـکات، دەبێـت کار لەسـەر مرۆڤـەکان بـکات، لێرەوە ڕۆحییەتـی سیسـتم هەنـدێ جـار لـە شـێوەی بەرخوردیدا لەگـەڵ مرۆڤەکان دەردەکەوێـت، هەندێـک جاریـش وەک جەبرێکـی ئۆبژێکتیـڤ و دەرەکـی دێتـە مەیـدان. ڕۆحییەتـی سیسـتم تەنیـا ڕێکخسـتنی واقیـع نییـە لـە ڕێـگای هەندێـک میکانیـزم و یاسـا و ڕێگرتـن و چەپانـدن و ڕێپیدانـەوە، تەنیا ونکردنـی هەنـدێ ڕەگـەز و دەرخسـتنی هەندێکـی تـر نییـە... بەڵکـو ئـەو بیرکردنەوەیەیـە کـە سیسـتم دەرەوەی نییـە، ئێمـە هـەر چییـەک بکەیـن لـە نـاو سیسـتمداین، واتـە وێناکردنـی سیسـتمە وەک گەمارۆیەکـی ئەبـەدی و ئابلۆقەیەکـی گـەورە، وەک

شوێنێک کە دەرەوەی نییە، وەک چێوەیەکی ترانسیدێنتال کە پێشمەرجی هەموو مەرجێک و پێشخاکی هەموو دیاردەیەکە.

لەم وتارە بچوکەدا هەوڵدەدەم بە گەڕانەوە بۆ سێ فەیلەسوف ئەگەرەکانی تێپەڕاندنی سیستم یان شکاندنی ڕۆحیەتی سیستم بخەمە بەر خوێندنەوەوە، پرسیارەکەشم ئەوەیە ئاخۆ ئادەمیزادەکان دەتوانن و هێز و بەهرەی ئەوەیان لە ناودایە کە سنوور بۆ گەمارۆی ئەو ماشێنە گەورەیە دابنێن؟ ئاخۆ هەلومەرجی ئەنتۆلۆژی مرۆڤ بە ڕاست لە خزمەت ئەو گەمارۆیەدایە؟ ئایا بە ڕاست «سنتێز» ـی هیگڵی لە دوا دەرەنجامدا داخستنی دەرگای دونیایە بەسەر بازنەیەکدا کە هەردەم ڕوو لە داخستنە، یاخود دەتوانین وەک ژیژیک دەڵێت «سنتێز» وەک ئەو مەحاڵە سەیربکەین کە بێهودە دەیەوێت بەسەر ناکۆکییەکی ئەبەدیدا سەربکەوێت، بەڵام ناتوانێت و نایگاتێ؟. لێرەدا بە گەڕانەوە بۆ هەندێک مۆدێلی فیکری بۆ وەڵامێکی یەکەمی و سەرەتایی بۆ ئەگەری تێپەڕاندنی سیستم دەگەڕێم. سەیری ڕێگا جیاوازەکانی تێپەڕاندنی سیستم دەکەم بەوجۆرەی هەندێک لە فەیلەسوفەکان دەیخەنە بەردەممان. بۆ ئەم مەبەستە لە سێ شێوە دارشتنی جیاوازدا سەیری کێشەکە دەکەم. یەکەم: لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ ئەنتۆلۆژیای «ئەوەی هێشتا نەبووە - Noch nicht sein» لای بلۆخ. دووەم: لە ڕێگای پیشاندانی ئەوەی کە سیستم ئێمە دروستیدەکەین لای «جۆن هۆلۆوی». سێهەم : لە ڕێگای تێڕامانەوە لە ئەگەری وەستانەوە بە ڕووی سیستمدا و مەسەلەی سوبێکت لە نێوان «میشال فۆکۆ» و «سلافۆ ژیژیک» دا.

# ئەرنست بلۆخ و
# «ئەنتۆلۆژیای ئەوەی هێشتا نەبووە»

## «بەراوردێک لەگەڵ جاک دێریدا دا»

سەرەتا لە ڕستەیەکی جاک دێریداوە لەسەر دیموکراسییەت دەست پێدەکەم کە ڕەنگە ئاسانترین خاڵێک بێت لێوەی بچینە ناو باسەکەوە. دێریدا دەڵێت « دیموکراسییەت هەمیشە لە داهاتوودایە، لەوەدایە کە دێت و لەوەدایە کە بەڕێوەیە. ئەوە جەوهەرێتی. تا بمێنێتەوە بەتەنیا ناتوانێت بگاتە کەماڵی بێسنووری خۆی، لەبەرئەوە هەمیشە دەرەدەست و سەر بە پاشەرۆژە». «١» « دێریدا. ٢٠٠١. ل٤٠٩». ئەم پرۆسەیە، پرۆسەی تەواونەبوونی دیموکراسییەت، پرۆسەی ئەوەی کە خاڵێکی کۆتایی و جێقاچێکی جێگیر بۆ دیموکراتیزەکردن نییە، مانای هیچ کات دیموکراسییەت لە دۆخی کەماڵدا ناگرین و پێی ناگەین، ئەمە تێزەیەکە بەرەو ئەوەمان دەبات زۆر ورد بیر لەوە بکەینەوە کە لە مێژوو و لە سیاسەتدا خاڵێکی کۆتایی نییە، واتە بە کورتی سیستم جێگایەکی تێدا نییە لەویادا بوەستێت و جێگیر بێت، هەموو جوڵەیەک بەرەو داهاتوو، جوڵە نییە بەرەو ئارامییەکی کۆتایی یاخود بەرەو هێنانەدی جەوهەرێکی پێشوەخت داهێنراو، بەڵکو جوڵەیەکی ناکۆتایە بەرەو نادیار... کە جوڵەی کۆتایی نەبوو، سیستمیش فۆرمێکی کۆتایی و دواشێوەی نییە، لەبەرئەوە ئەوەی بۆی دەگەڕێین هەرگیز پێی ناگەین، بەڵکو هەمیشە

لە پێشدەممانداییە، هەمیشە لە داهاتوودایە، هەمیشە نەگیراو و ناتێپەڕ و نەبەستراوەیە. ئەم مەجازەی «دێریدا» کە «دیموکراسییەت هەمیشە لە پاشەڕۆژدایە» مانای هیچ سیستمێک ناتوانێت خۆی وەک مۆدێلێکی کۆتایی و دوا خاڵی ناو پڕۆژەیەکی بەرجەستەبوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشانبدات... هەمیشە شتێک هەیە کە نەکراوە و هیچ سیستمێک دوانیگاری دیموکراسییەت بەرجەستەناکات.

پرسیاری سەرەکی دوای ئەمە ئەوەیە، ئەم نادیارە، ئەم خاڵە کە پێی ناگەین، ئەو پنتە کە نایگەینێ، ئەو ئامانجەی بۆمان ناکرێتە بوونێکی راستەقینە و لەگەڵ وشەگەلی وەک «واقیع» و «ڕاستی» و «تیاژیان» و «پێکەوەبووندا» کۆناکرێتەوە، واتە نابێت بە ڕاستی و ناکرێت تیابژین و لەگەڵیدا کۆنابینەوە... ئەمە چییە؟. ئەم شتە چییە کە هەمیشە لە پاشەڕۆژدایە و هەرگیز لە ئێستادا نییە؟. ئەم پرسیارە بە جۆرێک لە جۆرەکان خولیای هەموو فەلسەفە یاخود لایەنی کەم لە هیگڵەوە خولیای تەواوی فەلسەفە گرنگەکانە، پرسیار لەو ڕەگەزەی نەفی سیستم دەکات، ناهێڵێت بگاتە کەماڵ و دوودڵییەکی قووڵ دروستدەکات. دیارە زۆربەی فەلسەفەکان کە قسە لەو ڕەگەزە ناوەکییە دەکەن، لەو یەکە ڕیزپەڕ و لاتەریکە ڕادەمێنن، بۆئەوەیە تێیپەڕێنن و بگەنە یەکێتییەکی گەورە و میتافیزیکی. هۆلدەرلین لە شیعرێکدا ئێجگار قەشەنگ تەعبیری لەو خواستی یەکێتییە کردوە و دەڵێت « با ئەو جەنگە ئەبەدییەی نێوان خۆمان و جیهان کۆتایی پێبهێنین... لەگەڵ سروشتدا یەکبگرینەوە و ببینە یەکەیەکی ناکۆتا، ئەوە ئامانجی هەموو هەوڵێکمانە». ئەم دێڕەی هۆلدەرلین بزوێنێکی ناوەکی زۆربەی فەلسەفە دێرینەکانە، ڕەنگە ئەوە خاڵی جیاوازیشیان بێت لەگەڵ فەلسەفەی هاوچەرخدا. گەڕانەوە بۆ یەکێتی، یاخود گەڕان بەدوای پنتێکدا جەنگی نێوان ئێمە و دونیای تێدا کۆتایی بێت و یەکەیەکی ناکۆتا دروست ببێت. دیارە ڕۆحی سیستمیش بە

جۆرێک لە جۆرەکان هەر ئاماژە بۆ ئەو خواستە دەکات، بۆ سەپاندن و وێناندنی ئەو یەکێتییە، بەڵام کە دەڵێم ڕۆحی سیستم ڕوو لە یەکانگیری و دژ بە ناکۆکییە، مانای ئەوە نییە هەموو ئەو فەلسەفانەی کە بە قووڵی لەسەر یەکانگیری و دروستکردنی تەبایی «کۆنزێنس» ئیشدەکەن، لە ناوەوە ئاماژەیان بۆ هێزی نەفیکەر تێدا نییە. فەلسەفەی بلۆخ یەکێکە لەو فەلسەفانەی بە ڕووکارە یۆتۆپی و بە خواستە ناوەکییەکەیدا بۆ یەکخستنەوەی «سوبێکت و ئوبێکت»، لە ڕوکەشدا تۆتالیتار و یەکێتیخواز دەردەکەوێت، بەڵام کە قووڵ دەڕوانین، کۆمەڵێک ڕەهەندی گرنگ لە فەلسەفەی بلۆخدا دەبینین کە ئاماژە بۆ ئەو هێزە ناوەکییە دەکەن کە دەشێت مایەی پەشۆکانی هەموو سیستمێک بێت. دیارە فەلسەفەی بلۆخ لە بەشێکی گرنگیدا پەیوەندییەکی نزیکی بە فیکری دیالەکتیکییەوە هەیە، بەتایبەت دیالەکتیکی هیگڵی و هەوڵی تێپەڕاندنی دوالیزمی «سوبێکت ـ ئۆبێکت» لای هیگڵ، بەڵام ئەوەی لە دیالەکتیکدا گرنگە، مەسەلەی «سنتێزە» کە لەدواجاردا هەوڵی تێپەڕاندن و کۆکردنەوەی هەموو دژەکانە لە یەکەیەکی باڵاتردا، بەڵام لای بلۆخ سنتێز لاوازییەکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێت. هەرکات سنتێزیش «واتە سەقفی کۆکەرەوەی هەموو دژەکان» لاوازبوو، ئیدی دەرگا لەسەر پرۆسەیەکی گۆڕانی هەمیشەیی دەکرێتەوە کە تێپەڕاندنی سیستم تێیدا نەوەک شیاو و گونجاوە، بەڵکو پرۆسەی تێپەڕاندن ریشەیەکی ئەنتۆلۆژی هەمیشەیی بۆ دەسازێت و لە ناو خودی وجوددا بەربەستێکی ناوەکی و ئەبەدی نامێنێت سیستم شانی بداتە سەر. بلۆخ لە ڕێگای چەمکی «ئەوەی ـ هێشتا ـ نەبووە » ئاسۆیەکی گرنگ لەسەر جوڵە دەکاتەوە. بەبڕوای بلۆخ لە فەلسەفەی یۆنانییەوە، بوون وەک یەکەیەکی تەواو و ئامادە و پێرفێکت بینراوە، ئەو لای هایدگەریش هەمان کێشە دەبینێت، واتە بوون لای هایدگەریش وەک بوویەکی کامڵ و کۆتایی سەیردەکرێت، نەوەک

وەک «بوونێک کە هێشتا نەبووە». بەڵام دژایەتیکردنی ئەم ڕوانینە «تەواونیگارە» بۆ بوون و سەیرکردنی وەک بوونێکی نوقسان و ناکامڵ، کە خودی ئەم ناکامڵییە لە ناوەوە بوون دەجوڵێنێت و ئامادەی بزاڤی دەکات، خاڵێکی جەوهەری بیرکردنەوەی ئەرنست بلۆخە. هەتا وشەی «بۆشایی» کە لای سلاڤۆ ژیژیک لە فەلسەفەی ئەم ساتەدا نرخێکی گەورەی هەیە، لە زمان و ڕیتۆریکی بلۆخدا ئامادەگییەکی گەورەی هەیە. بۆیە لە ڕووی مێژووییەوە بڕوانین ڕۆحی گۆڕانخواز لە فەلسەفەی بلۆخدا ناگەڕێتەوە سەر دیالەکتیکی هیگڵی و وەختە بڵێم بەجۆرێک لە جۆرەکان هەوڵی تێپەڕاندنی هیگڵییەتە بۆ جۆرە دیالەکتیکێکی کراوەتر کە زاراوە سەرەکییەکانی لەسەر «تاراندن ـ نەفی» و «تاراندنی تاراندن ـ نەفی نەفی» ڕانەگیراوە، بەڵکو لەسەر زاراوەگەلی وەک یۆتۆپیا، ئومێد، هێشتا نەهاتن و هێشتا نەبوون دروستبووە. دیارە زەحمەتە مرۆڤ لەگەڵ هەموو بۆچوونەکانی بلۆخدا بێت، بەتایبەت لای من تێگەیشتنی بلۆخ لە پێکەوە گونجاندنی تەواوەتی نێوان «ڕێکی و ئازادی» یاخود وەک ئەو ناویان دەنێت «ڕێکخستنی کۆنکرێت» و «ئازادی کۆنکرێت» کەمێک دەستکرد و زۆرکار دێتەبەرچاو. ئەو دەڵێت «ئازادی کۆنکرێت بریتییە لە ئیرادەی کۆمەڵایەتی لەساتی خۆدەرخستندا، وە بریتییە لە ئیرادەی هاتووەدی کۆمەڵگا. بەڵام ڕێکخستنی کۆنکرێت بریتییە لە شێوە و فیگەری هاتووەدی ئەو کۆمەڵگایە خۆی» «بلۆخ ٩٧». دیارە ئەمجۆرە بۆچوونانەی بلۆخ و ئەمشێوە نیگایە بۆ ئازادی دەرەنجامی ئەو فەزا مارکسییەیە کە لە سەردەمی بلۆخدا باڵادەست بوو. بەڵام ئەمجۆرە تێزانە گرنگی هەندێک ڕەگەزی دیکەی فەلسەفەکەی ئەو لە بیری مۆدێرندا ناسڕنەوە، بەجۆرێک وەلاوەنانی مەتریالیزمی مارکسی ناکرێت بەجۆرێکی میکانیکی وەک هۆکاری وەلاوەنانی هەموو چەمکە گرنگەکانی ناو فەلسەفەی بلۆخیش سەیربکەین. چونکە ڕەگەزێکی ئەنتۆلۆژی گرنگ

لـە فیکـری بلۆخـدا هەیـە کـە دەشـێت ناکۆکـی و پەشـێوی بنێتـە هـەر سیسـتمێکەوە. ئانـا فۆلکۆفیـچ لەسـەر بلـۆخ دەڵێـت: «ناکـۆک لەگـەڵ ئـەوەی چاوەڕواندەکرێـت، فەلسـەفەی بلـۆخ کاتێـک زیندووتـر دەردەکەوێـت کـە لـە ڕوانگـە مێژووییەکـەوە لێـی بڕوانیـن، نـەوەک لـە سـاتی گیـرۆدە و ئالودەبوونیـدا بـە پرسـیارەکانی ئـەم قۆنـاغ و سـەدەیەوە سـەیریبکەین» «ڕۆلـف یوکـەر. ١٨٠». بەڕای مـن ئـەو بۆچوونـە تـا ئەندازەیـەک ڕاسـتە، بلـۆخ کاتێـک بایەخـی گـەورە وەردەگرێـت کـە دایببڕیـن لـە سـەردەمی خـۆی و لـە ڕەوتـی مێـژووی فەلسـەفەدا بیخوێنینـەوە. گرنگـی بلـۆخ بـۆ ئـەم وتـارەی مـن لـە تێگەیشـتنییەوە بـۆ مانـای چەمکی«ئێسـتا» یاخـود چەمکـی «ئـەم چرکـە سـاتە» وە دەسـت پێدەکات. بەبڕوای ئـەو «ئێسـتا» گەرچـی زۆر لـە ئێمـە نزیکـە و ئێمـە لـە ناویـدا دەژیـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا گەلێـک تاریکـە و زۆر لـە زوڵمەتدایـە، بەبـڕوای ئـەو تاریکـی بەشـێکی گرنگـی هەمـوو ئـەو سـاتانەیە کـە تێیـدا دەژیـن. ئـەم «تاریکییـە» لای بلـۆخ ئاماژەیـە بـۆ نادیارێکـی هەمیشـەیی، بـۆ پەڵەیـەک کـە لـە ناوەڕاسـتی بووندایـە و ناسـڕێتەوە، بـۆ شـتێک کـە نییـە و دەشـێت هەبێـت، بـۆ عەدەمێکـی سـک پـڕ بـە ئەگـەری تـازە، بـۆ نادیارێـک کـە دەشـێت ببێتـە شـت، بـۆ شـتگەلێک کـە نیـن بـەڵام دەشـێت هەبـن. واتـە ئـەو تاریکییـە گەرچـی تاریکییەکـی هەمیشـەییە، بـەڵام تاریکییەکـی گـۆڕدراوە، هەمیشـە هەمـان تاریکـی نییـە، هەمـان ئەگـەری لـە نـاودا نییـە و هەمـان فیگـەر لـە ناویـدا خـۆی حەشـارنەداوە. ئـەم تاریکییـە کـە لـە نـاو ڕۆحـی هەنوکەدایـە و بـە ئێمـە نابینرێـت، ئـەو شـتەیە کـە هێشـتا نەبـووە، بیرکردنەوەیەکـی «دانەخـراوە، کراوەیـە، هیـچ وەڵامێـک تێـری نـاکات» «دیتلـف هۆرسـتەر. ٤٢»، واتـە شـەوێکە کـە داناخرێـت و کۆتایـی نایـەت. لـە ڕاسـتیدا ئـەم شـوبهاندنەی بلـۆخ بـۆ هەنوکـە وەک تاریکییەکـی پـڕ ئەگـەر، زۆر نزیکـە لـە پێناسـەی هیگڵـەوە بـۆ مـرۆڤ وەک «شـەوی جیهـان»، هیگڵیـش مـرۆڤ

وەک ئەوجۆرە ڕووبەرە تاریکە سەیردەکات کە بێشومار و ناکۆتا ئەگەری لە خۆی گرتووە، شەوی جیهان واتە دەریایەک لە ئەگەری نەبینراو، ئەگەری لە تاریکیدا هەڵگیراو، هیگڵ دەنوسێت «مرۆڤ ئەو شەوەیە، ئەو بۆشاییە هیچەیە، کە هەموو شتێکی لە سروشتە هەرەسادەکەیدا هەڵگرتووە، مەملەکەتێک پڕە لە نیگار و وێناکردن»، ئەم شوبهاندنەی مرۆڤ وەک شەوێکی پڕ نیگار کە هەرجارە و لە هەر گۆشەیەکەوە وێنەیەکی دەردەکەوێت، نزیکییەکی تەواوی لەگەڵ چەمکی «هێشتا ـ نەبوون» ی بلۆخیدا هەیە، کە ئەویش تاریکییەک و شەوێکی پڕ ئەگەرە. دیارە ئەم تێزە هیگڵییە ئەمڕۆ لای فەیلەسوفێکی گرنگی وەک سلاڤۆ ژیژیک شوێنێکی زۆر سەنگین وەردەگرێت و هەر بە ناوی «شەوی جیهان»ـەوە کتێبێکی تایبەت دەنوسێت. بلۆخ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم تاریکیە دەگەڕێتەوە بۆ سەر هیراکلیتس و سەیرکردنی بۆ ئێستا وەک ساتێکی گۆڕاو، وەک چرکەیەکی عەدەم، بەڵام بلۆخ لە بنەوەڕا عەدەم وەک نەبوونی ڕەها سەیرناکات، «نەبوون» بە مانا تەقلیدییەکەی ، واتە بە مانای هیچی موتڵەق لای ئەو بوونی نییە، ئەوەی هەیە «هێشتا ـ نەبوونـە«Noch – Nicht Sein. بۆئەوەی هەست بە نەبوون بکەین، مانای هەست بە «نەبوونی نەبوون» بکەین، دەبێت هەستمان بەوەکردبێت کە شتێکمان نوقسانە، واتە شتێک هەیە کەدەبێت هەبێت و لێرە نییە، بەبێ ئەم هەستە نەبوون خۆی دەرناخات، بەمجۆرە لای بلۆخ نەبوون Nicht مانای هیچی Nichts نییە، بەڵکو مانای «لێرە ـ نەبوون Nicht – Da». «مانفرێد کلاین. ١١٢». «لێرە نەبوون» مەسەلەی نەبوون لە فۆرمێکی موتڵەق دەردەهێنێت و دەیخاتە ناو بەرنامەی کاتەوە، واتە ئەوەی وەک واقیع لێرە نییە، وەک ئەگەر لێرەیە. ئیدی کۆی پرسە فەلسەفییەکانی وەک « جەوهەر، حەقیقەت، تۆتالیتەیت، مادە، هەروەها بوون و بیرکردنەوە دەکەونە سەر تەوەری کات و کاتیش

بەڕووی داهاتوودا دەکرێتەوە» «مونتز ـ کۆینن، ئینگا .٢٧». کەواتە «هێشتا نەبوون» مانای بوون بەجۆرێکی شاردراوە و بنەکی «لاتێنس»، ئیدی «نەبوون» وەک «هەمیشە نەبوون» دەرناکەوێت، بەڵکو وەک شێوەی سەرەتایی بۆ «هێشتا ــ نەبوون» دەردەکەوێت. لێرەوە جیهان لای بلۆخ لابۆرێکی گەورەیە کە ئەو ئەگەرانە تێیدا دەردەکەون کە لە تاریکی ئێستادا چاوەڕوانی هەلی دەرکەوتن دەکەن.

بە بڕوای بلۆخ « هێشتا ـ نەبوون » کەموکورتی و نوقسانی و کەچییەکە کە بوون دەیەوێت تێیپەڕێنێت. دیارە سروشتی ئەم «هێشتا ـ نەبوونە» لە نێوان خواستی فەردەکان و خواستی کۆمەڵگادا جیاوازی هەیە. ڕەنگە یەکێک تەنیا خەونێکی تاکەکەسانەی خۆی هەبێت و سنووری «هێشتا ـ نەبوون» لای ئەو لەوە تێنەپەڕێت ئەو خەونە بێنێتەدی کە نەهاتۆتەدی، وەک ئەوەی یەکێک بیەوێت ببێتە دکتۆر یان دەوڵەمەندبێت، یان سەفەربکات. واتە بەجۆرێک لە جۆرەکان سوبێکت ڕۆڵێکی گرنگ لە دیاریکردنی سنووری هێشتا نەبووندا دەگێرێت.

بلۆخ لە بنەڕەتدا دووجۆر ئەگەر جیادەکاتەوە «ئەگەر لە ناو فیکردا» لەگەڵ «ئەگەر لە واقیعی ئۆبێکتیڤدا». مرۆڤ بۆنەوەی بفڕێت هەزاران ساڵ پێش دروستکردنی فڕۆکە لە خەیاڵدا بیری لە فڕین کردۆتەوە، فڕین لێرەدا ئەگەرێکە لە ناو بیردا، بەڵام کە هەلومەرجی گەشەی زانستی گەورەدەبێت، فڕین دەبێتە ئەگەرێک لە واقیعی ئۆبێکتیڤدا. بلۆخ یەکانگیری نێوان ئەگەر لە بیر و لە واقیعی ئۆبێکتیڤدا بەمەرجێکی گرنگی پرۆسەی لەدایکبوونی نوێ «نۆڤێم» لەقەڵەم دەدات. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە کە لای بلۆخ گۆڕان لە ئاستی ڕۆحیدا، واتە لە ئاستی زیهنی و هوشیاری سوبێکتیڤدا بە مەرجی دەرکەوتنی لە واقیعی ئۆبێکتیڤدا حیسابدەکرێت. لێرەوە لای بلۆخ زاراوەیەکی سەرەکی و گرنگی تر دێتەپێشێ کە ناکرێت خۆمانی لێلابدەین، پێی دەگووترێت «ئەوەی ـ

هێشتا - پێی هوشیار نین «Das Noch-Nicht – bewusste».
لای بلۆخ پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان «ئەوەی هێشتا نەبووە» لەگەڵ «ئەوەی هێشتا پێی هوشیار نین» هەیە، بەبڕوای ئەو هەرکات باسمان لە هوشیاری کرد باس لە بوون و کاتێک باس لە بوون دەکەین باس لە هوشیاری دەکەین.

بلۆخ «نەست ـ لاشعور» بەسەرزەمینی ئەو بابەتانە دەزانێت کە پێی هوشیار نین. واتە «ئەوەی - هێشتا - پێی هوشیار نین»، بە جۆرێک لە جۆرەکان لای بلۆخ ناوێکی ترە بۆ «نەست - لاشعور». بەم تێگەیشتنە نوێیەی بلۆخ دەبێت بە سەرەتای ئەوانەی لە دەرەوەی قوتابخانەی دەرونشیکار دەستکاری مانای نەستیان کردوە. نەست یاخود ئەوەی - هێشتا - پێی هوشیار نین، لای فرۆید پەیوەندی بە رابوردووەوە هەیە. نەستی فرۆید ئەو شتانەی تێدایە کە لە ڕابوردوودا چەپێنراون و هەڵگیراون و کراون بە ژێرەوە، بەڵام نەستی بلۆخی ڕوو لە داهاتووە، ئەو شتانەی تێدایە کە سبەی سەرهەڵدەدەن. بەبڕوای ئەو نەست بۆنی ژێرزەمینی لێنایەت، بەڵکو بۆی شەماڵی سبەینێی لێدێت. واتە نەست عەمباری شتە شاردراوەکان نییە، بەڵکو جێگای سەرهەڵدانی نیگارەکانی دوارۆژە. «دواتر لای لاکانیش نیگایەکی لەمجۆرە بۆ نەست دەبینینەوە. بڕوانە دوا وتاری ئەم کتێبە». بەپێی بلۆخ هەموو مرۆڤەکانی دونیا خەونی بەرەو باشتر چوون و هیوای ڕووەو خۆشتر بوونیان لە خۆیاندا هەڵگرتووە، نەستی بلۆخی شوێنی ئەو خەونانەیە. بلۆخ بە پێچەوانەی فرۆیدەوە جیاکاری لە نێوان ڕۆژەخەون و شەوەخەوندا دەکات، یاخود زیندەخەون و خەوندا... خەونی بلۆخ مرۆڤ بە ڕۆژ دەیبینێت نەوەک بە شەو. «جیبۆنگ شین، شی یۆنگ زین ل.٢٧». لای بلۆخ (هەر وەک لای فرۆید) دەرکەوتنی ناوەڕۆکی نەست تووشی ڕێگری دەبێت، واتە بۆ گواستنەوە «لەوەی هێشتا نەبۆتە هوشیاری»یەوە بەرەو «هوشیاری»

لەمپەر هەیە، دەبێت ببڕدرێت. فرۆید ئەو ڕێگرانە بە «سیستمی سانسۆری دەرونی» ناودەنێت، بەڵام بلۆخ ناویدەنێت بەربەست Sperre. سانسۆری فرۆیدی ملکەچی میکانیزمێکی دەرونییە، بەڵام بەربەستی بلۆخی کۆمەڵایەتی و ئۆبێکتیڤی و مێژووییە. بەبڕوای بلۆخ بۆئەوەی شتێک لە نەستدا دەربکەوێت و وەک شتێکی هەست پێنەکراو قسەی لێبکەین دەبێت زەمینەی بابەتی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی هەبێت. ناوەڕۆکی نەست و خەون و ئەگەرەکانی داهاتوو هەموو پێکەوە نایەنە سەر سەحنەی مێژوو، بەڵکو وەک بلۆخ دەڵێت «زەمان پلانەڕێی خۆی هەیە». بۆئەوەی شتێک وەک نەست دەربکەوێت، دەبێت وەک ئەگەرێکی مێژوویی لە ناو واقیعی ئۆبێکتیڤیدا سەرەتاکانی دەرکەوتبێت، هەربۆیە بلۆخ بایەخێکی گرنگ بە ڕستە بەناوبانگەکەی مارکس دەدات کە دەڵێت «مرۆڤایەتی تەنیا ئەو گرفتانە دەخاتە ئەستۆی خۆی، کە دەتوانێت چارەسەریانبکات». بەم پێودانە «ئەوەی پێی هوشیار نین»، جارێکی دی ئەو تاریکییە نیشاندەداتەوە کە دەشێت لە ناوەوە پڕبێت لە ئەگەر و شتی نوێ و توانای گۆڕان، هەر کات ئەگەرێکی ناو هوشیاری لەگەڵ ئەگەرێکی ناو واقیعی ئۆبێکتیڤدا تەبابووەوە، ئەو «پرۆسێسە» دەست پێدەکات کە پرۆسێسی بە واقیعیکردنی ئەو ئەگەرەیە. هەر لەم دیدەوە بلۆخ دەستکاری چەمکگەلێکی گرنگی وەک یۆتۆپیا و نیشتیمانیش دەکات و مانای نوێیان دەداتێ. نیشتیمان لای بلۆخ سەرزەمینێکی ئامادەنییە کە ئێمە تیا لە دایکدەبین، بەڵکو جێگایەکە دروستیدەکەین، ئەو جێگایە نییە کە تیادەژین، بەڵکو ئەو جێگایەیە کە بەرەو ڕووی دەڕۆین... سەر زەمینی هاتنەدی هیوا و گەشبینییەکانە، جێگایەکە کەس لەوێ نەبووە، کەس هێشتا لەوێ نەژیاوە، بەڵکو هەمووومان بەرێوەین بەرەو ئەوێ، واتە شوێنێکە کە هێشتا نەبووە و دەشێت هەبێت. واتە سەفەرێکە بەرەو دەرەوەی شتەکان، بەرەو دەرەوەی ئێستا و بەرەو دەرەوەی ئەو

شوێنانەی گەمارۆمـان دەدەن.

ئەوەی لە تێگەیشتنی بلۆخدا گرنگە، ئەو کرانەوە گەورەیەیە بەسەر ئەگەرە ناوەکییەکانی مێـژوودا. لای بلـۆخ بە ڕوونـی لاوازبوونـی چەمکـی «حەتمییەتـی دیالەکتیکـی» دەبینیـن، لاوازبوونـی ئەوجـۆرە لـە لۆژیکـی حەتمـی گرنگـە بۆئـەوەی سیسـتم وەک جێگایـەک ببینیـن کـە مـرۆڤ دروسـتیدەکات و هەڵبژاردنەکانـی مـرۆڤ ڕوخسـاری پێدەبەخشـێت، تـا لەسـەر خاکـی حەتمییـەت بیـن، لـە نـاو سیستمیشـدا دیلیـن و دەربازمـان نییـە. جیاوازی نێوان هیـگڵ و بلـۆخ لـەوەدا نییـە کـە باوەڕیـان بـە گۆڕان نییـە، مەسـەلەی گـۆڕان چ لای هیـگڵ و چ لای بلـۆخ خاڵێکـی سـەنتراڵ و ناوەندییـە، بـەڵام دیالەکتیکـی هیگڵـی ملکەچـی لۆژیکێـک و جوڵەیەکـی ناوەکـی حەتمییـە، کـە دەشـێت و دەکرێـت تەنیـا بـە یـەک ڕێـگادا بـڕوات، کـە لـە سـوبێکتی ڕەهـاوە دێـت و بەنـاو لۆژیـک و سروشـت و مێـژوودا دەڕوات، تـا دووبـارە لـە ئاسـتێکی باڵاتـردا دەگاتـەوە بـە خـۆی و لەگـەڵ شوناسـی خۆیـدا یەکدەگرێتـەوە. خـودی ئـەم جوڵـە گەردونییـە گەورەیـە لـە دیالەکتیکـی هیگڵیـدا، ملکەچـی ئـازادی و هەڵبـژاردن و سـوبێکتی فـەردەکان نییـە، بەڵکـو زنجیرەیـەک یاسـای حەتمـی دەبیـات بەڕێـوە. بـەڵام بلـۆخ چ مێـژوو و چ هوشـیاری، چ دونیـای ئۆبێکـت و چ دونیـای سـوبێکت وەک جێگایـەک سـەیردەکات کـە پـڕن لـە ئەگـەر، ڕۆڵێکـی زۆر گرنگیـش دەبەخشـێتە هوشـیاری مـرۆڤ لـە وەرگرتـن و گرتنـەوەی ئـەو ئەگەرانـەی لەواقیعـی ئۆبێکتیڤـدا هـەن. لای ئـەو چ هوشـیاری و چ جیهـان جێگایـەک نیـن پێشـتر هەمـوو شـتێکیان تێـدا دیاریکرابێـت یـان پێشـوەخت تـەواوی نەخشـەکەیان لەسـەر هەڵکەنرابێـت. بـوون لای ئـەو دراوێکی موتڵـەق و نەگۆڕ نییـە، بەڵکـو شـوێنێکە تێیـدا چەمکـی کرانـەوە، چەمکـی هیـوا، چەمکـی دەرچـوون لـەوەی کـە هەیـە، چەمکـی ناحەتمیبـوون، لـە هەمـوو شـتێکیش گرنگتـر ڕۆڵـی مـرۆڤ و هوشـیاری وەک کایـە و مەڵبەنـدی ئـەو دەرکەوتنانـە،

گرنـگ و دیاریکـەرن. لێـرەدا بـوون هەرگیـز ناتوانێـت دوا قسـەی خـۆی بـکات، هوشـیاریش ناتوانێـت بگاتـە دوا فەنتازیـای خـۆی، نیشـتیمانیش دەبێتـە ئـەو جێگایـەی کەبـەرەو پیـری دەڕۆیـن و یۆتۆپیـاش دەبێـت بـە پـڕۆژەی هەمیشـەیی مـرۆڤ، بـە هەوڵـی هەتاهەتایی مـرۆڤ بـۆ پیادەکردنـی خـەون. یۆتۆپیـای بلۆخـی بەتەنیـا بۆنـی خەیاڵـی لێنایـەت، بەڵکـو بۆنـی واقیعیشـی لێدێـت، یـان وەک خـۆی دەڵێـت یۆتۆپیایەکـی ئەبسـتراکت نییـە و یۆتۆپیایەکـی کۆنکرێتـە، بـەڵام یۆتۆپیایـەک نییـە بگاتـە دوا سـنووری خـۆی... بگاتـە جێگایـەک جیهـان و هوشـیاری تێیدا بەسـەر «ئەوەی هێشـتا نەبووە» و «ئـەوەی هێشـتا پێـی هوشـیای نیـن» دابخرێـت. بـوون لای بلـۆخ «هێشـتا نەبوون»ـە... لێـرەوە سیسـتمی داخـراو یـان سیسـتمی ئەبـەدی، سیسـتمێک بتوانێـت ڕێگرییەکـی ڕەهـا لـە گۆڕانـی ناوخۆیـی بـکات بوونـی نییـە... بەپێـی بلـۆخ هەمیشـە شـتێکی دی هەیـە کـە دەبێـت گوێڕادێربیـن تـا دەنگـی شـەپۆلەکانی ببیسـتین کـە لـە پاشـەڕۆژەوە دێـت، هەمیشـە دەنگێکی نـوێ هەیـە کـە میلۆدییەکانـی لـەدوورەوە دەبیسـترێت. مـرۆڤ بوونەوەرێـک نییـە تەنیـا لەسـەر پرەنسـیپەکانی دوێنـێ بخەوێـت، بەڵکـو بوونەوەرێکـە لەسـەر خەونـی سـبەێنێ دەخەوێـت. سیسـتم ناتوانێـت بەربەسـت بێـت لـە ڕێـگای ئـەوەی هێشـتا لێـرە نییـە و ئـەوەی هێشـتا نەسـەلمێنراوە، ناتوانێـت ڕێگربێـت لـەوەی هوشـیاریمان «سـەرەتا وەک ئیدراکێکـی شـاردراوە، وەک ئامادەگییەکـی بچـوک و هەسـت پێنەکـراو، وەک هەسـتکردن بـە نادیارێـک کـە تـەواو ڕوون نەبۆتـەوە» هەسـت بـە تـەزووی گـۆڕان بـکات. بلـۆخ بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ڕێـگای ڕەخنەکـردن لـە «لـۆک» و هەسـتە ئەزمونکارەکەیـەوە، لـە ڕێـگای گەڕانـەوە بـۆ «لایبنتـز» و دەرککردنـی بـە ڕۆڵـی ئیدراکـی نهێنـی لـە نـاو مرۆڤـدا بـە ڕووی هەرجـۆرە پەیوەندییەکـی میکانیکـی لـە نێـوان هەسـت و جیهانـدا دەوەسـتێتەوە.

تاریکییـەک لـە ناوەڕاسـتی جیهاندایـە، شـەوێک لـە ناوەڕاسـتی بووندایـە،

پەڵەیەکی ڕەش لەسەر هوشیاریمانە کە لەوێوە دەنگی دیکە دێت، سلاڤۆ ژیژیک لەمڕۆدا ئەمە بە شەبەق، بە درز ناو دەنێت ، بەو جێگایەی سیستم تێیدا بە ناتەواویی خۆی دەگات. دیارە نزیکییەکی زۆر و دوورییەکی فەلسەفی قووڵیش لە نێوان بلۆخ و ژیژیکدا هەیە کە لێرەدا باسناکرێت. بەڵام بە بڕوای من چەمکی «سوبێکت وەک شەبەق» لای ژیژیک «کە هەڵبەت لە جەوهەردا تێزێکی لاکانییە»، هەروەها سەیرکردنی نەست وەک بەتاڵییەک، وەک تاریکییەک کە ناکۆکی ناکۆتای ناو بوون دەردەخاتەوە... هەردووکیان نزیکایەتییەکی قووڵیان لەگەڵ تێگەیشتنی بلۆخدا بۆ تاریکی ناو ئێستا و تاریکی ناو بوون و تاریکی ناو هوشیاری هەیە. کە پێکڕا نوقسانی و سنووری سیستممان بیردەخەنەوە.

لێرەدا جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ لای جاک دێریدا، بۆ لای دیموکراسییەتە ناکۆتاکەی ئەو کە لەسەرەوە ئاماژەم بە پەرەگرافێکی بچوکی کتێبی « سیاسەتی هاوڕێتی» دا. ڕاستە دێریدا و بلۆخ لەگەڵێک ڕووەوە گەلێک ناکۆکن، باوەڕی بلۆخ بە یۆتۆپیا لەگەڵ ئەو ڕۆحە «پۆست ـ یۆتۆپییەی» ناو پۆستمۆدێرنەدا تەبانایەتەوە، بەڵام مێژوو وەک شتێک کە هەمیشە «شتێکی دی تیا بەڕێوەیە» شتێک کە هێشتا نەبووە و دەشێت هەبێت، تەواو لەگەڵ دیموکراسییەتە کراوەکەی دێریدا دا تەبایە، لەم خاڵەدا من دێرێدا وەک ڕادیکالیزەکەری تێزەکەی بلۆخ دەبینم. دێریدا ئەم تێزە تا ئەودیو ڕەهەندە یۆتۆپییەکانی دەبات.

گەر فیکری بلۆخ لەسەر چەمکی ئەگەر« Das Möglice» ڕاوەستابێت، ئەوا خەیاڵی سیاسی لای جاک دێریدا لەسەر گەیشتن بە «نەگەر ـ مستحیل» یاخود «نائەگەر ـ اللاممکن» « Das Un-Mögliche» ڕاوەستاوە . دێرێدا لە سنووری ئەو نەگەرانەدا ناوەستێت کە واقیع و مێژوو و هوشیاری پێشکەشیدەکەن، بۆیە دێریدا یەکێک

لە رادیکالترین فەیلەسوفەکانی پۆستمۆدێرنەیە... ئەو پێناسەیەی کە سیاسەت وەک هونەری ممکن وەسفدەکات، لای دێریدا گۆرانێکی رادیکاڵ بە خۆیەوە دەبینێت و دەبێت بە هونەری نامومکین. دیرێدا گەرۆکێکی گەورە و تێکدەرە کە تەنیا بۆ گەیشتن بە ئەگەرەکانی بەردەممان ئیش ناکات، بەڵکو بۆ گەیشتن بە نەگەرەکان، بەو ئاسۆیانەی کە هێشتا دەرنەکەوتوون ئیشدەکات. لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٩٨ دا لەگەڵ «تۆماس ئاسهاوەر» دا دەڵێت «من تەماحم لە یۆتۆپیا نییە، من داوای موستەحیل دەکەم». لەگەڵ ئەم جیاوازییە بە روکەش گەورەیەشدا، لە قووڵاییدا وادەرناکەوێت کە بلۆخ و دێریدا زۆر لەیەک دووربن. بەرای ئەو مرۆڤ نابێت لە سنووری ئەگەرەکانی بەردەمیدا بوەستێت، بەڵکو دەبێت روو لە دوورتربکات. بەبروای ئەو گەر مرۆڤ تەنیا خۆی لەگەڵ ئەگەردا بگونجێنێت، مانای خۆی لەگەڵ پێشبینیکراو و پرۆگرامکراو و پێشوەخت بینراودا دەگونجێنێت. «شتێڤان مۆبیوس، دیتمەر ڤێتزل. ١٥».

مرۆڤ گەر ورد بروانێت نزیکییەکی گەورە لە نێوان چەمکی نائەگەری دیریدا و چەمکی ئەگەری بلۆخیدا دەبینێت. هەردوو چەمکەکەش پێ لەسەر واقیعیەتی خۆیان دادەگرن، «ئەگەر» لای بلۆخ بزوێنەری پرۆسێسی یۆتۆپییە، لای دێریداش «نائەگەر» بزوێنەری کردارە، پرۆسیسی یۆتۆپی لای بلۆخ و کردار لای دێریدا لە مانادا زۆر لەیەکەوە نزیکن. دێریدا نائەگەر یان موستەحیل وەک خەیاڵێکی نەکردە ناخاتە بەردەمی مێژوو و سیاسەتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە «وەک فیگەری واقیع خۆی» وەسفیدەکات. بەبروای ئەو موستەحیلیش وەک واقیع وەهایە، نزیک، رەق، خۆسەپێنە، شتێکیشە پەیوەندی بەم ساتەوە هەیە، هەروەها پرۆژەیەکیش نییە دوابخرێت، بەڵکو لە رۆحی ئەم ساتەوە دەجوڵێت، ئێستا و ئالیرە دروشمێتی. «هەمان سەرچاوەی پێشوو. ١٥».

جگە لەوە چەمکی دیموکراسییەتی ناکۆتا لای دێریدا نزیکییەکی گەورەی

لەگەڵ چەمکی «ئەوەی هێشتا نەبووە»ی بلۆخیدا هەیە. دیموکراسییەت لای دێریدا هەمیشە لە وەدایە کە دێت، نەوەک لەوەدا بێت کە هەیە. دیموکراسییەت فۆرمێکی داخراو نییە، کۆتاییەکی نییە، ئەمە لەدەوڵەتی سۆسیالیستی و دینی جیایدەکاتەوە، واتە فۆرمێکە لەدەسەڵات کە هەمیشە دەکرێت شتێکی دی بۆ زیادبکرێت، هەمیشە بەسەر داهاتوودا دەکرێتەوە. لێرەوە لای دێریدا چەمکی «ئەوەی کە دێت» نزیکییەکی گەورەی هەیە لەوەی کە «هێشتا نەبووە»ی بلۆخی... لای دێریداش هەمیشە شتێکی ناتەواو هەیە کە هەرگیز تەواو نابێت، لای بلۆخیش هەمیشە شتێک هەیە کە هێشتا نەبووە و دەشێت هەبێت.

## جۆن هالۆوی: سیستم ئێمە دروستیدەکەین

لە بەشی پێشوودا ئەو ڕوانگەیەم پێشکەشکرد کە لە ڕێگایەوە دەتوانین سیستم و جیهان پێکڕا وەک یەکەیەکی ناتەواو ببینین، یەکەیەک بونیادنانی ناکۆتایە و دروستکردنی ناگاتە دوا ئاست و هەمیشە شتێک دەمێنێتەوە کە تەواویبکەین. بەڵام لەگەڵ ئەو زەمینە تیورییە گەورەیەشدا کە فیکری گۆڕان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەیەتی، لەگەڵ ئەوەی بەدرێژایی مێژوو لە ئەرستۆوە فەیلەسوفان لەسەر تەفسیری گۆڕان و یاساکانی جوڵە و میکانیزمەکانی بەرەو پێشچوون کاردەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی ڕادیکال، هەڵهاتنی نائەگەری دێریدایی، هەڵهاتنی یۆتۆپیای بلۆخی لە هەندێک ئاستدا تەنیا تیوری و نەکردە و ناواقیعی دەردەکەون. زۆرجار وادیارە، وەک ئەوەی جیهان هەمیشە خۆی دووبارەبکاتەوە، وەک ئەوەی لە بەردەم گەڕانەوەی ئەبەدی هەمان شتدا بین، وەک ئەوەی سیستم ئەبەدی و بازنەیی و ناتێپەڕ بێت.

دیارە سیستم ناوێکی فرە مانایە، بۆ نمونە کە پۆستمۆدێرنەکان باس لە هەمەڕەنگی دەکەن، یان دەمێک باس لە پەرشبوونەوە و نەبوونی سەنتەر لە ناو سیستمدا دەکەن، وەک ژیژیک دەڵێت، بوارێکی گرنگی وەک ئابووری تەواو لە سیاسەت دەتەکێنن و خاڵیدەکەنەوە. بۆ نمونە قسەی بەردەوامی پۆستمۆدێرنەکان لەسەر تێپەڕاندنی سیستم، لە ئاستی ئابووریدا بە قسەیەکی ڕوون سەبارەت بە تێپەڕاندنی سەرمایەداری لە ناو سیستمدا گرێنادرێتەوە... دیارە مەسەلەکە ئەوە نییە کە پۆستمۆدێرنەکان دژی سەرمایەداری نەبن، بەپێچەوانەوە بە بڕوای من ڕەخنەی پۆستمۆدێرنە لە تەواوی کولتووری خۆرئاوا، لە جوغزە میتافیزیکییەکانی، لە ستەمە ژێرەوانکێکانی، هەروەها هەڵوێستی سیاسی و ئەخلاقی بیریارە گەورەکانی وەک فۆکۆ و دێریدا و لیوتارد نیشانەی ئەو ناتەباییە قووڵەی نێوان پۆستمۆدێرنە و ڕۆحی کۆنترۆڵکەری سەرمایەدارییە... بەڵام کێشەکە ئەوەیە لە دوای هەرەسی فیکری و ئەخلاقی ئایدۆلۆژیا شۆڕشگێڕەکانی سەدەی بیست، بە گشتی دۆزینەوەی ڕێگا بۆ دەرچوون لەسەرمایەداری یان ڕزگاربوون لەو سیستمە ئابووری و سیاسییەی دونیا جڵەودەکات، نەکردە و نادیار دەردەکەوێت. ڕۆحییەتی پۆستمۆدێرنە بەو دژایەتییە قووڵەیەوە بۆ کۆنترۆڵ و وەک یەک لێکردن و نەهێشتنی دەسەڵاتی گەورە، تا ئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ ڕۆحی کۆنترۆڵکاری سەرمایەداری و گیانی وەک یەک لێکردن و ڕۆحی ئیمپراتۆرخواز و پەلهاوێژی سەرمایەداریدا ناگونجێت، گەرچی سلافۆ ژیژیک پێیوایە پۆستمۆدێرنە لەگەڵ ئەو ئاسۆیانەدا تەبایە کەسەرمایەداری پێشکەشیدەکات و بەرهەمی ڕێپێدانی سیستمەکەیە و پێداگرتنی لەسەر جیاوازی مەرجی بڵاوبوونەوەی خێرای جیهانگیرییە، بەڵام ئەو ڕەخنەیە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە پۆستمۆدێرنە سەرشارە بەو ڕەگەزانەی کە ئیش پێکردنیان وە ڕاکێشانیان تا دواسنووری ڕاستەقینەی خۆیان، چەکێکی فیکری و ئەخلاقی و سیاسی گەورەمان دژ بە سەرمایەداری و هەموو

سیستمێکی داخراوی تر پێدەبەخشێت. ئەمە جگە لەوەی کە ڕەخنەی فەیلەسوفانی پۆستمۆدێرنە لە سیستم لە ئاستی فەلسەفی و سیاسی و ئەخلاقیدا ڕەخنەیەکی قووڵتر و دووربینتر و رادیکالتر و تێکدەرترە لە ڕەخنە کۆنەکان، بەتایبەت لە مارکسییەتی تەقلیدی. بەڵام ڕەخنەکەی ژیژیک لەوەدا دروستە کە باس لە بەناسیاسیکردنی کایەی ئابووریدا دەکات لە پۆستمۆدێرنەدا. دیارە کۆمەڵێک فەیلەسوف لە مارکسیستە نوێکان، هەوڵدەدەن ئەو چەقبەستنەی سەرمایەداری بە تەکنیکی نوێ تێپەڕێنن. سەرەنجڕاکێشترینیان لای من «جۆن هالۆوەی» یە.

بلۆخ و دێریدا هەردووکیان لەسەر چاوەڕوانکردنی داهاتوو، «ئەوەی هێشتا نییە لای بلۆخ» و «ئەوەی کە دێت لای دێریدا» ئیشدەکەن، لەسەر ئەوەی کە داهاتوو هەموو ئەگەرەکانی تێدایە، لەوانە ئەگەری هاتنەدی یۆتۆپیا و ئەگەری وەدیهێنانی موستەحیلیش. بەڵام جۆن هالۆوەی بە ئاراستەیەکی تر بیردەکاتەوە، هالۆوەی بیر لەوەدەکاتەوە ڕابوردوو بوەستێنین. دیارە هالۆوەی لە کتێبە گرنگەکەیدا « جیهان بگۆڕین، بێئەوەی دەسەڵات بگرینە دەست» تیورێکی نوێ لەسەر دەسەڵات و دوو جەشنی جیاوازی دەسەڵات پێشکەشدەکات، دیدێکی نوێ بۆ چەمکی چین کە جیاوازە لە چەمکی مارکسی پێشەکەشدەکات، لای هالۆوەی هەموو «نارازییەکان» چینێک بەرامبەر سیستم پێکدەهێنن. لێرەدا نامەوێت تەواوی بۆچوونەکانی هالۆوەی حیکایەتبکەم، کە تا ئەندازەیەکی زۆر پشت بە ئەزموونی زاپاتیستە مەکسیکییەکان دەبەستێت و وانە و حیکمەت لەوان وەردەگرێت. بەڵام دەگەڕێمەوە سەر وتارێکی بە ناوبانگی هالۆوەی کە لە نۆفەمبەری ٢٠٠٣ دا لە مۆزەخانەی هونەری هاوچەرخ لە لشبۆنە پێشکەشیکردوە، بەناونیشانی «ئیدی ڕاوەستن، چیدی لەوە زیاتر سەرمایەداریی بخولقێنن» «بڕوانە تەواوی وتارەکەی جۆن هالۆوەی، لە گۆڤاری گروندریس ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠٠٤». هالۆوەی لێرەدا بە بەراوردێکی نێوان ڕۆمانە بەناوبانگەکەی «ماری

شیللی» «فرانکنشتاین» لەگەڵ کورتە چیرۆکێکی بۆرخیسدا بە ناونیشانی «وێرانە بازنەییەکان» دەست پێدەکات، کەهەڵبەت ئەویش لە کورتە چیرۆکە زۆر ناودارەکانی بۆرخیسە کە بەدەگمەن خوێنەرێکی بۆرخیس هەیە نەیخوێندبێتەوە. لای ماری شیللی دکتۆر فرانکنشتاین، ڕۆح لەبەرێک دروستدەکات کە دوای دروستبوونی، بوونێکی سەربەخۆ وەردەگرێت و چیتر لە ژێر دەسەڵاتی خاوەن و دروستکەرەکەیدا نامێنێتەوە و دەچێتە دەرەوەی توانای کۆنترۆڵی ئەو. هەڵبەت زۆرجار کەپیتالیزم بە ڕۆحلەبەرەکەی فرانکنشتاین دەشوبهێنرێت، بە شتێک لە دەست خاوەنەکەی دەرچووە و بوونێکی سەربەخۆی وەرگرتووە و چیتر لە کۆنترۆڵدا نەماوە. فرانکنشتاین سەمبولە بۆ دەرچوونی سەرمایەداری لە کۆنترۆڵ، بەرەڵابوونی وەک درندەیەکی گەورە کە هیچ شتێک کۆنترۆڵی ناکات. ئەم وێنەیە، واتە وێنەی درندەیەک کە ناگیرێتەوە، هێزێک کە مرۆڤ خۆی دروستیکردوە و چیتر بۆی نابەسترێتەوە و بەسەر ئێسک و پروسکی داهێنەرەکەیدا دەڕوات، وێنەی سیستمێک کە چیتر ژیان و بەردەوامی لەدەستی ئێمەدا نەماوە و سەربەخۆ لە ئێمە دەژی و دەسەڵاتی مرۆڤەکان بەسەریدا بچوک و ناچیز و هیچە، وادەردەخات وەک ئەوەی توانای مرۆڤ بەسەر سیستمدا کۆتاییهاتبێت و چیتر سیستم لەوە کەوتبێت بکەوێتەوە ژێر ڕکێفی ئادەمیزادەکان و ئیرادەیانەوە.

هالۆوەی لەبەرامبەر ئەمەدا چیرۆکێکی دیکەی بۆرخیس دەهێنێتەوە، کە چیرۆکی «وێرانە بازنەییەکان»ـە، لەم چیرۆکەدا حکایەتی دروستکردنی مرۆڤێک بۆ یەکێکی دی دەگێڕدرێتەوە، بەڵام وەک فرانکنشتاین لە لابوردا نا، بەڵکو لە خەیاڵدا. مرۆڤێک موو بە موو و خانە بە خانە کەسێکی تر دروستدەکات، مەخلوقە خولقێنراوەکەی خەیاڵیش کەسێکە هەڵدەستێت و دەڕوات و دەجولێت، هەموو سیفەتەکانی مرۆڤی ئاسایی هەیە، بەڵام بە پێچەوانەی بوونەوەرەکەی دکتۆر فرانکنشتاینەوە بوون و مانەوەی هەمیشە

گرێدراوی توانای خەیاڵی ئەو کەسەیە کە دروستیکردوە، واتە لەو ساتەدا کە کەسی خولقێنەری لەوە دەکەوێت خەیاڵبکات، ئەم مەخلوقەش لەوە دەکەوێت بژی. بەبڕوای هالۆوەی سەرمایەداری یاخود سیستم بە گشتی لەم مەخلوقەی ناو چیرۆکەکەی بۆرخیس دەچێت نەوەک لە مەخلوقەکەی ناو چیرۆکەکەی ماری شیللی. بەبڕوای ئەو سەرمایەدارییەت دڕندەیەکی دەستکرد نییە بەریوبێت، بەڵکو دڕندەیەکە کە بەردەوامی و ژیانی بەوەوە بەستراوە کە ئێمە چەند دروستیدەکەین و دووبارە دروستیدەکەینەوە. هەر کاتێک ئێمە لەوەبکەوین چیتر سەرمایەداری دروست بکەینەوە و بەرهەمیبهێنین ئەوکات سەرمایەداری لەوە دەکەوێت بەردەوام بێت. هالۆوەی دەڵێت «سەرمایەداری ئەمڕۆ لەبەرئەوە ناژی کە دووسەد ساڵ یان سەد ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە. بەڵکو لەبەرئەوەی ئەمڕۆ دروستیدەکەن، ئەگەر بەیانی لەوەبکەوین دروستیبکەینەوە، چیتر ناژی». بە واتایەکی تر هالۆوەی دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونەکەی مارکس کە سیستم وەک پەیوەندی «Verhältnis» سەیردەکات «بویکلمان، ١٥٩». کە گوتمان سیستم پەیوەندییە، واتە وەک مەخلوقەکەی بۆرخیس، ژیان و بوونی گرێدراوی کاری ئێمەیە، هەروەخت ئێمە لەوە کەوتین دروستیبکەینەوە، ئیتر لەوە دەکەوێت بژی. هالۆوەی بەم تێزەیەی سیستم وەک بەرهەمی سوبێکت دەبینێت، وەک دەرەنجامی ئیش و خەیاڵی سوبێکت. سیستمی ئەمڕۆی دونیا بەردەوامی خۆی لە باڵادەستی ئۆبێکتەوە بەسەر سوبێکتدا وەرگرتووە، لە هەر سیستمێکدا نەگۆڕان و بەردەوامی زاڵ بوو، واتە سوبێکت بووە بە ژێر فشاری ئۆبێکتەوە، مانای مرۆڤ بووە بە ژێر مەرجەکانی بارودۆخەوە و باڵادەستی خۆی بەسەر سیستمدا نەماوە. لای مارکس مرۆڤ خۆی خولقێنەری کاڵایە، بەڵام کاڵا لە ناو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا دەکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی ئێمە، بەمە لە نێوان مرۆڤ و بەرهەمی کارەکەیدا نامۆبوونێکی قووڵ دروستدەبێت، بەڵام مارکس داوادەکات، مرۆڤ هەرگیز ئەوەی لە

یادنەچێت کە کالاّ بەرهەمی کاری ئێمەیە، ئێمە دروستیدەکەین، نەوەک خۆی خۆی دروستبکات، لێرەوە دەسەلاّتی کالاّ بەسەر مرۆڤدا، یاخود مردنی سوبێکت لە بەردەم بەرهەمی کاری خۆیدا، لەسەر تێنەگەیشتن و بیرچوونەوە و هوشیاریی نادروست خولقاوە. هالۆوەی دەڵێت ئەو بابەتەی کە خۆی کردوە بە سالار بەسەر مرۆڤەوە، ژیان و مانەوەی بەدەست مرۆڤ خۆیەتی، ئۆبێکت شتێک نییە لەدەرەوەی توانای سوبێکت. فەلسەفەی هالۆوەی فەلسەفەیەکی سوبێکتیڤە، زۆر لەسەر ئیرادەی مرۆڤ ئیشدەکات، جیاوازی لەگەڵ مارکسیزمی تەقلیدیدا ئەوەیە کە شان داناداتە سەر ئەو گرێمانە و تێزانەی کە پێیان وایە سیستم دەرەنجامی ناکۆکییە ناوەکییەکانی ناوخۆی و وەک هۆی گەیشتنی ئەم ناکۆکیانە بە ئاستێکی دیاریکراوی گەشە دەگۆڕێت، گەر ئێمە سیستم نەگۆڕین هیچ مەرجێکی ئۆبێکتیڤ ناتوانێت بەشێوەیەکی میکانیکی سیستم بگۆڕێت. لە مارکسیزمی تەقلیدیدا ڕۆڵی سوبێکت سەنترال نییە، واتە مرۆڤ تەنیا ئەو فەرمانە جێبەجێدەکات کە هەلومەرجی دەرەکی و جیهانی بابەتی پێشکەشیدەکات، واتە سوبێکت وەلاّمی ئەو ئاماژانە دەداتەوە کە لە ناو جەرگەی ئۆبێکتەوە دێن، بەلاّم هالۆوەی جۆرێک لە مارکسیزممان پێشکەشدەکات تێیدا کاری مرۆڤ نەوەک یاسا حەتمییەکان هۆکاری سەرەکی گۆڕانن. گەڕانەوە بۆ سوبێکتی کارا، نەوەک بۆ یاساکانی گەشە لە ناو دونیای ئۆبێکتدا ئەوە تێزەی سەرەکی هالۆوەیە.

هالۆوەی دەڵێت «هەموو دیاردە کۆمەلاّیەتییەکان لێرەن، چونکە ئێمە دروستمانکردون، چۆن مرۆڤ ئوتۆمۆبیلی دروستکردوە، پارە و دەولّەتیشی هەروا دروستکردوە. بەلاّم گەر لەوە زیاتر بڕۆین دەڵێین: هەموو دیاردە کۆمەلاّیەتییەکان، بۆیە لێرەن چونکە ئێمە دروستمانکردون و بەردەوام دروستیاندەکەینەوە. ئوتومبێل بۆیە لێرەیە چونکە ئێمە بەردەوام دروستمانکردوە و بەکاریدەهێنین، دەولّەت لێرەیە لەبەرئەوەی

ئێمە بەردەوام دروستمانکردوە و دروستمانکردۆتەوە، چونکە ملمـلان بۆ فەرمانە توندوتیژەکانی داوە و فۆرمەکەیمان قەبووڵکردوە... ئەم دیاردانە وەک مەخلوقەکەی فرانکنشتاین نین، بەڵکو وەک مرۆڤەکەی بۆرخیسن کە پیاوە خەوندارەکە بەرهەمیدەهێنێت، بوونیان چرکە لە دوای چرکە بە ئێمەوە بەستراوە» «هالۆوەی ٨».

رۆحی سیستم لە بەردەوامییەکەیدایە، لێرەوەیە هالۆوەی دەگەڕێتەوە سەر تێزێکی گرنگی والتەر بەنیامین و ڕوانینێکی دی سەبارەت بە سروشتی قۆناغی کۆمۆنیزم پێشکەشدەکات کە جیاوازە لە تێگەیشتنی مارکسیزمی کلاسیکی و تەقلیدی و دەڵێت «کۆمۆنیزم بالاترین پلەی گەشەی مێژوویی نییە، بەڵکو پەلاماردانە بۆ سەر بەردەوامێتی لە مێژوودا» «هالۆوەی ٨». واتە گەشە نییە بۆ پێشەوە، بەڵکو ڕێگرتنە لە مێژوو لەوەی خۆی دووبارەبکاتەوە. پەلاماردان یاخود کردنەوەی زۆرکاری و تەقاندنەوەی مێژوو لە تێزە گرنگەکانی والتەر بەنیامینیشە. والتەر بەنیامین لە وتارە گرنگەکەیدا بە ناونیشانی «دەربارەی چەمکی مێژوو» باس لە پاککردنەوەی مێژوو لە هەر بیرۆکەیەکی گەشە و پەرەسەندن دەکات، بەنیامین بە یەکێک لە نەیارانی هیستۆریزم دادەنرێت، بەپێچەوانەی بلۆخەوە لای بەنیامین زیندووکردنەوەی خەونەکانی ڕابوردوو، چالاککردن و سازاندنیان لە هەنوکەدا، بەشێکی گرنگی تێڕوانینی سیاسییە. لای ئەو داهاتوو، هێنانەدی ئەگەرە نادیارەکانی ناو مێژوو نییە، بەڵکو چالاککردنەوە و هەستانەوەی خەون و ئاواتە کوژراوەکانی ڕابوردووە، بەڵام لە ناو کۆمەڵێک پەیوەندیی و ناوکۆیی نوێدا. مەبەستی بەنیامین لە تەقاندنەوەی مێژوو، چالاککردنەوەی توانا خنکاوەکانی ناو مێژووە، زیندوکردنەوەی دەنگە دۆڕاوەکان و تەواوکردنی ئاواتە تەواونەکراوەکانە، دەرهێنانەوەی مانا کۆنەکان و زیندوکردنەوەیانە لە هەنوکەدا، لەمەدا بەنیامین دەگەڕێتەوە بۆ شێوە تێڕوانینی ڕۆبسپێر و شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ مێژوودا، کاتێک شۆڕشی فەرەنسی بە درێژکراوە

و تەواوکار و زیندووکردنەوەی ڕۆحی ئەو ململانێیە دەزانی کە لە نێوان ئەرستۆکراتەکان و کۆماریخوازەکانی ڕۆمدا ڕوویداوە. ئەم گەڕانەوەیە جیاوازە لە گەڕانەوە هەمیشەییەکەی نیتشە، بە پێچەوانەوە گەڕانەوەیەکە دەبێت ئێمە پێیهەستین، و ئێمە مێژوو وەربگرین و لە سیاقی تازەدا تەواویبکەین، لێرەوەیە بەنیامین لەبری ئەوەی باس لە گەشەی دیالەکتیکی بکات، باس لە خالێکی زۆر گرنگ دەکات کە بە «وەستانی دیالەکتیکی» ناویدەبات. لای بەنیامین بەبێ وەستانێکی دیالەکتیکی ناکرێت کولتووری دۆڕاوەکان لە مردن ڕزگاربکەین. گەر ڕەورەوەی مێژوو لە سوڕاندنەوە نەوەستێنین و کولتووری ڕابوردوو و کەلەپووری دۆڕاوەکان و شکستخواردوەکان نەهێنینەوە یاد، ئەو ڕزگارکردنە نەکردەیە.

هالۆوەی دیوی ئەو دیوی گەمەکەی بەنیامین دەگرێت، گەر بەنیامین لە خەیاڵی زیندووکردنەوەی کەلەپووری دۆڕاوەکاندایە، بۆ ئەوەی لە ئاستی یادەوەریدا شەڕ لەگەڵ دوژمنانی چینایەتیدا بکات و ڕاپبگەیێنێت کە دۆڕاوەکانی ئێستا کولتووری دۆڕاوەکانی دوێنێ دەپارێزن و دەیگێڕنەوە و دەیکەنەوە بەبەشێک لەمڕۆ. ئەوا هەلۆوەی باس لە زیندووکردنەوەی کولتووری دۆڕاوەکان ناکات لە بەرامبەر سیستمدا، بە پێچەوانەوە، داوای وەستانی سیستمەکە دەکات، لە ڕێگای «مانگرتنێکی جیهانییەوە»، یاخود «گۆڕینی پەیوەندییەکانی هێز لە ناو سیستمدا»، ئەو پێیوایە کە شۆڕش بەیەکجار ناکرێت، بەڵکو بەجۆرێکی ڕۆژانەو بەردەوام و لە ڕێگای گەورەبوونی هەرچی زیاتری هاوارەکانەوە ڕادەستدەبێت، بەجۆرێک دواجار مرۆڤەکان پێکرا یەک هێزی دەستەجەمعی دروستبکەن کە تێیدا ڕۆڵی سوبێکتی ئازاد بەرابەر سیستم کارابێتەوە «هالۆوەی ۲۰۰۲. ۱۰ ـ ۲۰» .

لە ڕاستیدا تێزەکەی هالۆوەی پتر لە تێزەیەکی ئینشایی دەچێت، کاتێک داوادەکات مرۆڤەکان پێکرا بەیەکەوە بڕیاربدەن لە ژێر سایەی کەپیتالدا کارنەکەن، چیتر ڕێگربن لەوەی ئیشکردنیان ببێتە کاری ناو سیستم.

هالـۆوەی دەگەڕێتـەوە سـەر خاڵێـک و جیاکارییـەک کـە نزیکـە لـە تێزەکـەی بلۆخـەوە، لای ئـەو «جیـاکاری... لـە نێـوان ئـەوەی کـراوە و ئـەوەی نەکـراوە، چۆن کـراوە و چـۆن نەکـراوە» «هالـۆوی .٢٠٠٢ . ١١٢» دەتوانێـت زەمینـەی سـەرەتایی ئـەو کۆبوونـەوە گەورەیـە بێـت، کـە لـە ڕێگایـەوە «ئێمـەWir» یەکـی گشـتی دروسـتدەبێت کـە پێویسـتە بـۆ شـکاندنی ڕیتمـی بەردەوامـی سیسـتم. لای هالـۆوەی دروشـمی «یـا باسـتا Ya Basta» «ئیـدی بەسە»ـی زاپاتیسـتەکان، سـەرەتای کۆبوونـەوەی ئـەو دەنگانەیـە کـە دەشێت لەدواجـاردا بەجۆرێـک گەورەبێـت، سیسـتم لـە پەیوەندییەکانـی ناوەوەیـدا ڕابگرێـت و بیشـکێنێت. هالـۆوەی ڕوویەکـی تـا ئەندازەیـەک ئەنتۆلـۆژی نـەوەک سیاسـی بـەم ھاوارە دەبەخشـێت و دەنوسـێت «چـۆن بزانیـن کـە دروشـمی یـا باسـتا «ئیـدی بەسـە» هەیـە و بەشـدەکات؟ بـەوەدا دەزانیـن چونکـە بەشـێکە لـە ئێمـە، لەوانەیـە چەپێنرابێـت، یـان لـە فۆرمێکـی ناکۆکـدا دەربکەوێـت، بـەڵام هەمیشـە لـە ناوماندایـە و لەبەردەسـتماندایە... ئێمـە ئەمەمـان لـە ڕێگای ئەزموونـەوە وەرنەگرتـووە، بەڵکـو «ئـەم ڕەهەنـدە» بەشـێکی دانەبـڕاوی ژیانـە لـە کۆمەڵـگا سـتەمکارەکاندا» «بوێکلمـان. ١٦١». دیـارە ئـەم تێگەیشـتنەی هالـۆوەی بـێ ڕەخنەکـردن تێناپەڕێـت، گەورەتریـن ڕەخنەیـەک ڕووبـەڕووی ئـەم تێـزە ئەنتـی کەپیتالیسـتییەی هالـۆوەی دەبێتـەوە، ئەوەیـە کـە لـە ڕێـگای ئـەو سـتراتیژە گشـتی و جیهانییـەوە تـەواوی جیاوازییـە گـەورەکان و هەمەڕەنگـی بزاوتـی ئەنتـی گلۆبالـی و ئەنتـی دەسـەڵات دەکوژێـت و پێکـڕا هەمـوو ئـەو جیاوازیانـە لـە نـاو یـەک ئێمـەی سەرتاسـەریدا کۆدەکاتەوە .«ئوفە بـاک ١٧٣».

ئـەوەی لـە تێزەکـەی هالۆوەیـدا گرنگـە گەڕانەوەیـە بـۆ ئـەو ڕاسـتییە لـە بیرکـراوە کـە «ژیانـی سیسـتم» بەدەسـت ئێمەیـە. سیسـتم ناتوانێـت لـەدەرەوەی دانپیانانـی ئێمـە بوونـی هەبێـت، ئێمـە سیسـتم دروسـتدەکەین، ئـەوە ئـەو ڕاسـتییەیە کـە نابێـت لـە بیریبکەیـن. بـەڵام ئـەوەی لێرەدا ترسـناکە و دووبارەکردنەوەیەکـی کوشـندەی سـیفەتە تەقلیدییەکانـی فیکـری چەپـە،

ئـەو سـادەکردنەوەیەتی بـۆ چەمکـی بەرگـری، بـۆ تێڕوانینـی لەمـرۆڤ وەک بوونەوەرێـک کـە بـە هوشـیاری هەمـوو شـتێک تێدەپەڕێنێـت. ژیانـی سیسـتم بەدەسـت ئێمەیـە، بـەڵام تێپەڕاندنـی سیسـتم لـە ڕێـگای هوشـیاری سیاسـی موجـەرەدەوە نەشـیاو و نەکردەیـە. مـرۆڤ لـە نـاو تورێکـی ئاڵۆزتردایـە لـەوەی تەنیـا لـە ڕێـگای گووتنـی «یـا باسـتا» ـەوە لـە گەمارۆکـە بێتـەدەرێ. مـرۆڤ لـە نـاو تورێکـی ڕەمـزی ئاڵۆزدایـە کـە وادەکات دابڕاندنـی سـوبێکت لە سیسـتم و لەدایکبوونـەوەی بەجۆرێکـی نـوێ کارێکـی ئاسـان نەبێـت، جگـە لـەوەی تێپەڕاندنـی دەسـەڵات بـەو سـادەیەی هالـۆوەی باسـیدەکات نامومکینـە، ئێمـە لـە نیتشـەوە دەزانیـن کـە دەرچـوون لـە تورێ دەسـەڵات ئاسـان نییـە، فۆکۆش دواتـر ڕەهەندێکـی دیکـە بـەو تێـزە نیتشـەوییە دەبەخشـێت کاتێـک دەسـەڵات وەک شـتێک وێنـادەکات کـە لـە هەمـوو پنتێکـەوە هەڵدەقوڵێـت و بەردەوامیـش خـۆی دروسـتدەکاتەوە. بۆیـە ڕەتکردنـەوەی سیسـتم لـە ڕێـگای گووتنـی «نـا» یەکـی دەسـتەجەمعییەوە مانـای مردنـی سیسـتم ناگەیێنێـت، ئـەوەی بەیانـی هەسـتین و کەسـمان نەچینـە سـەر کار، وەسـتاندنی مێـژوو نییـە، بەڵکـو دووبارەکردنـەوەی مێـژووە، سیسـتم لەسـەر میکانیزمێکـی ئایدۆلـۆژی و پراکسیسـێکی شـەڕانگێزانەی ئەوتـۆ هەڵچنـراوە کـە دروسـتکردنی ئێمەیەکـی دەسـتەجەمعی یـەک ڕەنـگ بەرابـەری کاری نەکردەیـە، چونکـە لەجەوهـەردا مرۆڤـەکان بەسـەر گـروپ و شوناسـی وەهـا جیـاوازدا لەتلەتبوون، یەکخسـتنیان پرۆسـەیەکی گەلێـک ئاڵۆزتـری دەوێـت لـەوەی هالـۆوەی دەیخاتـە بەردەممـان. مـرۆڤ بـەو سـتراتیژەی هالـۆوەی پێشـنیاریدەکات دەشـێت سیسـتم لاوازبـکات و درزەکانـی گەورەبـکات، بـەڵام ئەسـتەمە بگاتـە ئاسـتی تێکشـکاندنی سیسـتم لـە هەمـوو ئاسـتەکان و لـە هەمـوو جیهانـدا... لێـرەدا بـە پێویسـتی دەزانـم کـە بگوازمـەوە بـۆ ئاسـتێکی قووڵتـر و باڵاتـری کێشـەکە لـە فیکـری هاوچەرخـدا، بـەو چەشـنەی لـە نێـوان فۆکـۆ و سـلاڤۆ ژیژێکـدا دەیبینیـن.

# له نێوان فۆکۆ و سلاڤۆ ژیژیکدا:
# کێشەی سوبێکت

## ئایا دەکرێت سیستم تێبپەڕێنین؟

فۆکۆ جیاواز لە زۆر لە فەیلەسوفانی دی لە جێگایەکی دیکەوە سەیری دەسەلات و سیستمی کرد. تێگەیشتنی فۆکۆ وادەکات تێکشکاندنی سیستم یان دەرچوون لە قەڵەمڕەوی دەسەلات زۆر سەخت بێت. ئەو پێیوایە فەرد ڕۆڵی پێچەوانەی دەسەلات نییە، بەڵکو دەسەلات فەرد دروستدەکات، واشدەبینێت کە جێگایەک لە کۆمەڵگادا نییە لە دەسەلات خاڵی بێت، دەسەلات هەتا بچوکترین خانەش دەبڕێت و دەبێتە بەشێکی ناوەکی پەیوەندییەکانی نێو هەموو سیستمێک. بەدیدی ئەو، دەسەلات لە فەردەوە دەرناچێت و بەسەر فەردێکی دیکەدا بکەوێت، واتە وەک گوللەیەک نییە لەسەرچاوەیەک دەرچێت و بەر نیشانەیەک بکەوێت، دەسەلات پتر وەک تۆپێک وایە کە کۆمەڵێک یاریزان لەگەڵ یەکدا یاری پێدەکەن، لە یەکی وەردەگرن و دەیدەنەوە بە یەک، تورێکی گەورەی پەیوەندی دروستدەکات کە ئەو تۆڕە سروشتی فەزای کۆمەلایەتی دیاریدەکات، بیرکردنەوە و ڕەفتار و پەیوەندی سوبێکت بە خۆشییەوە دەستنیشاندەکات. لەلای فۆکۆ فەرد تەنیا ناکەوێتە بەر ڕەحمەتی دەسەلات بەڵکو دەسەلاتیش دەداتەوە، واتە هەموو کەسێک بەپێی جێگای خۆی و بەجۆرێک لە جۆرەکان پراکتیکی دەسەلاتیش دەکات،

دەسەڵات تەنیا پراکتیزەکردنی هێز نییە، بەڵکو دروستکەری گوتارەکانە و سنوور و شێوەی بیرکردنەوەش دیاریدەکات، بە مانایەکی تر «خودی فەرد دەرکەوتەیەکی سەرەتایی دەسەڵاتە». «ئانهۆرن، بێتینگەر، شتێهەر. ل٨١». فەرد پۆلی پێچەوانەی دەسەڵات نییە، بەڵکو بەرهەم و کاڵایەتی.

بە پێچەوانەی تێگەیشتنی مارکسییەوە دەسەڵات لای فۆکۆ شتێک نییە لە ژێرخانی ئابووری و ئەو هێزانەوە بێتەدەرێ کە ژێرخانی ئابووری کۆنترۆڵدەکەن، بەڵکو هێزێکی سەرتاسەرییە کە بە کۆنترۆڵکردنی لە پنتێکدا، بە گۆڕینی ڕوخساری لە جێگایەکدا شتێکی ئەوتۆ لە تۆڕە گەورە و بەرفراوان و گشتییەکەی ناگۆڕدرێت. دەسەڵات لای فۆکۆ تەنیا دەسەڵاتە گەورەکان و سیستمی ئیشکردنی دەوڵەت ناگرێتەوە، بەڵکو ژمارەیەک پنتی بێشوماری مایکرۆدەسەڵات دەگرێتەوە. واتە دەسەڵات لە یەک جێگاوە ڕاهێڵ ناکرێت و بەتەنها لە یەک شوێن و یەک کەسەوە پراکتیک ناکرێت، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر بکەری جیاواز لە تورێکی کراوەی پەیوەندی و کارلێکدا دەسەڵات دروستدەکەن. فۆکۆ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم تێزەیە پەنادەباتە بەر لێکدانەوەی شێوازێکی کۆنی پراکتیککردنی دەسەڵات لە سەردەمی پادشایەتیدا لە فەرەنسا کە بە تەکنیکی «نامەی سەرمۆر Lettres de cachet» ناسراوە، کە جۆرە نامەیەک بووە پادشاکان بۆ گرتن و زیندانیکردن و دوورخستنەوەی هەندێکی کەس بەکاریانهێناوە، بێئەوەی بگەڕێنەوە بۆ پرۆسە یاسایی و دادوەرییە ئاساییەکان. ئەمجۆرە نامەیە بەگشتی دەرەنجامی داوایەک بووە کە لە خێزانەکانەوە بۆ دەرباری پادشا بەرزدەکرایەوە و داوای لێدەکرا ئەندامێکی خێزان بگیرێت یان دووربخرێتەوە، زۆربەی کاتیش کێشەکان کێشەی میرات و ڕێنەکەوتن و بەهەدەردانی سامانی بنەماڵەبووە. ئەو کەسەی کە داوای نامەی سەرمۆری دەکرد دەبایە چیرۆکێکی درێژ لە سەر داواکە و

هۆکانی بنوسێت و بەوردی نهێنییەکانی ناو ژیانی خێزان ئاشکرابکات و سەرپێچییە گەورەکانی کەسی تاوانبار بە شێوازێکی ئینشایی کاریگەر دابرێژێت تا کار لە پادشا بکات و بۆ گرتن و دەستبەسەرکردنی کەسی مەبەست بیجولێنێت، بێئەوەی پێویستی بە دادگا و پرۆسەیەکی دوورودرێژی هاتوچۆی بەردەمی دادوەر و پارێزەر هەبێت. ئەم نامەیە بە ڕوکەش دەسەڵاتی ڕەها و بێچەند و چوونی پادشا دەردەخات، بەڵام لە ڕاستیدا گەر تەماشابکەین، دەسەڵاتی پادشا لێرەدا بەشێکە لە تۆڕێکی گەورە و ئاڵۆز لە «پەیوەندی دەسەڵات»، واتە دەسەڵاتێکە بەبێ کاریگەری دەرەوە، بەبێ بوونی لەناو تورێکی تایبەتی پەیوەندیدا دەرناکەوێت، کە سەرەتا لە دەسەڵاتی ناو خێزانەوە دەست پێدەکات و بەو دەسەڵاتە دواییدێت کە پۆلیس و ژاندارمەکان بۆ گرتن هەیانە. تا لە دواییدا دەگەینە خاڵێک کە نامەی سەرمۆر وەک کۆمەڵێک کلێشەی لێدێت کە دەکەوێتە دەست بەڕێوەبەرەکانی پۆلیس و زۆربەی جار بەرلەدەرچوونی ڕەزامەندی پادشاهانە، ژاندەرمەری پاریس و بەڕێوەبەرەکانی ژاندەرمەری بۆ مەبەستی تایبەتی کاریان پێکردوە و سەدان خەڵکیان لە باستیل توندکردوە. ئەو دەسەڵاتەی کە ئەم نامەیە هەڵگرێتی، دەسەڵاتی یەک پنت و یەک کەس و یەک گووتار نییە، بەڵکو ڕستێک کارلێکی ئاڵۆز و تێکەڵاوە کە پێکەوە کارکردن و پێکەوە کارلێکردنی کۆمەڵێک پنتی جیاواز خولقاندوویانە، بەتاڵبوونەوەی حوکمی نامەکەش هەر بە هەمان سیستمی کارلێکردندا ڕابوردووە، واتە دەبایە پادشا خۆی حوکمێکی پێچەوانە دەربکات، یاخود لێبوردنێکی گشتی بدات، یان کەسانی خاوەن داوا دووبارە بە نامەیەک تکا لە پادشابکەن کە کەسە نزیکەکەیان ئازادبکات و لێیببورێت. «مازێت، ٩٤ تا ١٠٣». دیارە ئەم نامەیە بە جۆرێکی ئاشکرا دەریدەخات کە دەسەڵات لە پەیوەندی کۆمەڵێک دەسەڵات دروستدەبێت، لە زنجیربەندی، دانپیانان، پێکەوەکارکردن،

جیاکردنـەوە و لادان دەخولقێت، لەسـەرەوە نایـەت بـەرەو خـوارەوە، بەڵکـو لـە خواریشـەوە بـەرەو هەرەمـی دەسـەڵات سـەردەکەوێت. واتـە دەسـەڵات لـە زۆر لاوە دێـت و گرێچنییـەک دروسـتدەکات و لـە کۆی پەیوەندییەکانـی خـۆی سیسـتمێک دروسـتدەکات، کـە هەندێـک ڕەگـەز کۆدەکاتـەوە و هەندێکـی دیکەیـان دەکاتـە دەرێ. دیـارە لای فۆکـۆ دەسـەڵاتی مۆدێـرن مەکربازانەتـر کاردەکات، گـەر دەسـەڵاتی کـۆن خۆدەرخـەر و دەرەکـی بـوو بێـت، واتـە لـە ڕێـگای خۆنمایشـکردن و زەبـری دەرەکییـەوە خـۆی دەرخسـتبێت، ئـەوا دەسـەڵاتی مۆدێـرن ناوەکـی و ناڕاسـتەوخۆیە و کەمتـر خـۆی دەردەخـات، پتـر کۆنترۆڵـدەکات نـەوەک سـزابدات، واتـە خولقێنەرتـرە لـەوەی مـرۆڤ پێشـوەخت وێنایـدەکات. ئـەم ڕاسـتییە جێگایەکـی جەوهـەری لـە سیسـتمی بیرکردنـەوەی فۆکـۆدا هەیـە کـە وادەکات تێپەڕاندنـی سیسـتم یـان دەسـەڵات کاری نەکردەبێـت. مـرۆڤ لای فۆکـۆ شـتێکی دەسـتکردە، پێناسـەی ئێمـە بـۆ مـرۆڤ یاخـود بـۆ سـوبێکت پێناسـەیەکە گرێـدراوی پەیوەنـدی نێـوان دەسـەڵات و مەعریفەیـە و لەوێـوە سـەرچاوەی گرتـووە، چەمکـی مـرۆڤ و سـوبێکت دوو چەمکـی مێژوویـن و ئەبـەدی نیـن، واتـە سیسـتمێکی گووتـار هەیـە کـە لـە نـاو زانسـتە مرۆڤایەتییەکانـەوە سـەری دەرهێنـاوە و هاتۆتـەدەرێ، ئـەو تێگەیشـتنی ئێمـە بـۆ مـرۆڤ و خـودی داڕشـتنی سـوبێکت و پەیوەنـدی سـوبێکت بـە خۆشـییەوە دیاریـدەکات. بـە مانایـەک لـە مانـاکان واتـە سـوبێکت بوونـی نییـە، سـوبێکت پێکهاتێکـی دیاریکـراوی گووتـار و سیسـتمێکی تایبەتـی بەرهەمهێنانـی حەقیقـەت دروسـتیدەکات و دەیگۆڕێـت و شـوێن و شـێوازی پێدەبەخشـێت. لـەم ڕوانگەیـەوە سـوبێکت شـتێک نییـە لێـرەدا ئامادەبێـت، سـوبێکت شـتێکە «دەبێتـە سـوبێکت» و «فۆرمێکـە» لـە ناوکۆییەکـی تایبەتیـدا ڕوخسـاری خـۆی پەیدادەکات. بۆئـەوەی مرۆڤێـک خـۆی وەک خـاوەن «خـود ـ سـوبێکت» بزانێـت، دەچێتـەوە سـەر کۆمەڵێـک نـۆرم و سیسـتمی پێوانـە و پێـوەری حەقیقـەت کـە لـەدەرەوەی خـۆی

دروستبوون. مرۆڤ بۆئەوەی خۆی وەک مرۆڤ ببینێت، ئەو تۆرمانە بەکاردەهێنێت کە خۆی دروستی نەکردون، بەڵکو لە دەرەوەی خۆی بۆی دیاریکراون، هەر بۆیە سوبێکت خاڵی کۆبونەوە و بەریەککەوتنی گەلێک خاڵ و پنتە «مارتشوکات. ٨٧ ـ ٨٨». لێرەدا فۆکۆ رەخنە لە کولتووری خۆرئاوا دەگرێت کە لە رووبەرێکی گەورەدا تەنیا رووە نێگەتیڤەکەی دەسەڵات دەناسێت، ئەمەش دەگێڕێتەوە بۆ ئەو کولتوورە کانتییە کە لەسەر جیاکاری نێوان دوو چەمکی گرنگ دروستبووە، «رێپێدان» و «قەدەغەکردن»، «بۆت هەیە» و «بۆت نییە». «فۆکۆ. ٢٢٦». بەڵام فۆکۆ دەسەڵات تەنیا بە هێزێکی داپڵۆسێنەر نازانێت، بەڵکو وەک هێزێکی بەرهەمهێن و خولقێنەریش سەیریدەکات، خولقاندنی سوبێکت لەلایەن دەسەڵاتەوە تەنیا روویەکی نێگەتیڤی نییە، بەڵکو روویەکی بەرهەمهێن و خولقێنەریشی هەیە.

کێشەی ئەم تێڕوانینەی فۆکۆ ئەوەیە کە تێیدا دەسەڵات سەرتاپاگیرە، لای فۆکۆ رووبەڕووبونەوەی دەسەڵات، یان بەرگری لە دژی دەسەڵات، لەدواجاردا دەبێتەوە بەبەشێک لەدەسەڵات. لەوکاتەدا کە ئێمە رووبەڕووی دەسەڵات دەبینەوە، دەسەڵات بەرهەمدەهێنینەوە. هەموو بەرگرییەک لە بەرامبەر دەسەڵاتدا پراکتیککردنەوەی دەسەڵاتە، هەموو دژگەراییەکی دەسەڵات دەکەوێتەوە ناو باوەشی دەسەڵات. لێرەوە دژایەتی دەسەڵات دەربازبوون نییە لە دەسەڵات، بەڵکو گۆڕینی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتە. بەڵام بەو پێیە سوبێکت خۆی بەرهەمی دەسەڵاتە و ناتوانێت لە تۆڕی دەسەڵاتیش بچێتەدەرەوە، کەواتە ئێمە هەمیشە لە بازنەیەکی ئەبەدی و داخراودا دەسوڕێینەوە کە دەربازی تێدا نییە، هەمیشە لە هەمان تۆڕ و هەمان هاوکێشەداین و شتێک نییە ناوی دەرچوونی تەواوەتی بێت لە سیستم. لەگەڵ ئەم رەخنە جەوهەرییەدا لە تێزەکانی فۆکۆ، کە «سلافۆ ژیژیک» یش قەبوڵیدەکات، نابێت ئەوە بشارینەوە کە

فەلسەفەی فۆکۆ بە گشتی، فەلسەفەیەکی پاسیڤیست نییە، گەرچی فۆکۆ باوەڕی بەوەیە کە سوبێکت بەرهەمی دەسەڵاتە، بەڵام وەک فێرناندۆ سوارێز مویللەر دەڵێت فەلسەفەی فۆکۆ بەگشتی سەرقاڵی «ئازادکردنی فەردە لە دەست زنجیرەکانی ستراکتور، کە لە ئاستی زانست و دەسەڵات و نۆرمەکاندا گەشەیانکردوە»« فێرناندۆ سوارێز مویللەر. ١٧٥ ». ئەمەجگە لەوەی گەڕانەوە بۆ ئەتیکی گریکی دەربارەی پرۆسەی خۆسازاندنی سوبێکت و خۆخولقاندنی کە جیاوازە لە ئەتیکی مەسیحی و مۆدێرنە شوێنێکی گرنگی لە پڕۆژەی فۆکۆدا هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەم ڕەهەندانەشدا، لەگەڵ هەوڵی فۆکۆشدا بۆ داڕشتنی ئەتیکێکی تایبەتی خودخولقێن، وەها دەردەکەوێت وەک ئەوەی دەرچوونی سوبێکت لە دەسەڵات یان سیستم گەیشتبێتە بەر دەرگایەکی داخراو. ژیژیک لە کتێبە زۆر بەناوبانگەکەیدا «مەکری سوبێکت» هەوڵی تێپەڕاندنی ئەم کێشەیە دەدات. ژیژیک پێیوایە کە ڕاستە بەرگری و دژایەتی دەسەڵات، بەشێکی گرنگی خودی دەسەڵاتە، یان پنتە ناوەکی و میوانە ئاعەزیز و نیشتەجێ نهێنییەکەی ناو جەرگەی دەسەڵاتە، هیچ دەسەڵاتێکیش نییە بێبەرگری و بەرگریش بەشێکە لە پێکهاتی دەسەڵات، بەڵام ژیژیک لەناو ئەم بازنەیەدا ئەگەری تێکشکاندنی سیستم ناکاتەدەرەوە، ئەوەی بەرگری جۆرێکە لەدەسەڵات مانای ئەوە نییە کە ناتوانێت لە ناوەوە سیستم هەڵتەکێنێت و ئاراستەی نوێی تێدابکاتەوە، ئەمە ڕەگەزە گرنگ و زیادکردنە دیالەکتیکییەکەی ژیژیکە بۆ فۆکۆ. ژیژیک ئەوە داناخات کە «بەرگری» دەتوانێت پاڵێکی دیالەکتیکی بە سیستمەوە بنێت بۆ گۆڕان. بەبڕوای ئەو ئەوەی پێویستە فرەییە لە بەرگری و دژایەتی سیستمدا، سیستم کاتێک هەرەسدەهێنێت کە پرۆسەیەک لە پێکهاتە «ئەنتاگۆنیست ـ ناکۆک»ـەکەی ناوەوەیدا بخرێتەکار، کە دواجار بەرەو شکستی ببات. «ژیژیک. ٣٥٠». ژیژیک دیدی وەهایە کە دەسەڵات چەندە بەهێزبێت،

ناتوانێت ببێت بەو هێزەی هەموو ڕەگەزەکان و جیاوازییەکان کۆبکاتەوە. هەمیشە درزێکی هەمیشەیی و تێرنەبوونێکی ئەبەدی و تاریکییەکی ناوەکی دەمێنێتەوە کە سیستم پەردەکات لە نادڵنیایی، هەمیشە جێگایەک هەیە تێیدا سیستم بەر ناوکەیەکی ناوەکی و ڕەق دەکەوێت، بەر سنوورەکانی خۆی دەکەوێت و ناتوانێت تێیپەڕێنێت. لای ژیژیک بەرگری ئەو تاریکییە ناوەکی و سنوورە نەبڕدراوەی ناو دەسەڵات خۆیەتی. ئەو فەیلەسوفی بینینی ڕەگەزە دژەکانە لە قووڵایی هەر دیاردەیەکدا، لێرەوە کاتێک دەڵێین دەسەڵات ئەنتاگۆنیستە و لە جەوهەریدا ئەگەری دژایەتی خۆی هەڵگرتووە، لەهەمانکاتدا ئاماژە بەوە دەکەین کە دەسەڵات هەرگیز ناتوانێت دەرگا لەسەر دژایەتی دابخات، ناتوانێت هەموو شتەکان کۆنترۆڵبکات، ناتوانێت مێژوو کۆتایی پێبهێنێت. ژیژیک ئەم تێزەیە لە هیگڵ و لاکانەوە وەردەگرێت، لە هیگڵ نەفیکردنی بەردەوام و لە لاکان ئەو تێزەیەی وەردەگرێت کەدەڵێت «گەیشتن بە کەماڵ کاری نەکردەیە». ئیدی لەسەر ڕۆشنایی ئەو دوو پنتەدا لای ژیژیک بەرگری تەنیا دەسەڵات نییە، بەڵکو سنوور و نەفییە ناوەکییەکەی ناو دەسەڵاتە، ئەو شوێنەیە کە تێیدا دەسەڵات لە کاری دەرکەوتن و خۆنمایشکردندا نوشوستی دەهێنێت، ئەوەی ئەم نەفییە ناوەکییە دروستیدەکات هەر هەمان ئەو دۆخە نییە کە پێشتر هەبووە. بۆیە گەرچی سوبێکت خۆی بەرهەمی دەسەڵاتە، بەڵام دەرەنجام هەمیشە وەک هۆکار نییە، سوبێکت ڕووبەرێکی پاسیڤ و پەککەوتە نییە کە لە کارلێکیدا لەگەڵ دەسەڵات و لە کاتی بەرهەمهێنانیدا بۆ دەسەڵات هەر هەمان دۆخ بەرهەمبهێنێتەوە کە پێش کاریگەرییەکە ئامادەبووە، لای ژیژیک ئەو بەرگرییە ناوەکییەی لە خودی دەسەڵاتدا خەوتووە، دەکرێت بچێتە جێگایەکی باڵاتر و تەواوی سیستمەکە هەڵبتەکێنێت، واتە لە ئاستی ئەنتۆلۆژیدا دەکرێت دەرەنجام ئاستێکی باڵاتر لە هۆکار وەربگرێت «ژیژیک. ٣٥١». لای ژیژیک لەو

ساتەدا کە مرۆڤ بەرگریدەکات، هەمان سیستم و هەمان دەسەڵات بەرهەمناهێنێتەوە کە پێشتر هەبووە، ژیژک لەم خاڵەدا لاکانیترە لەوەی فۆکۆیی بێت، هەر لێرەشەوە ڕەخنەیەکی گرنگ ئاراستەی جودیس باتلەر دەکات کە ڕوو لە فۆکۆ دەکات بۆ دەربازبوون لە گەمارۆی سیستم، چونکە باتلەر پێیوایە لاکان بواری بۆ گۆڕان و ئازادبوون نەهێشتۆتەوە، بە ڕای ژیژکیش دەربازبوونی مرۆڤ و شکاندنی چوارچێوەی «سیستمی ڕەمزی» لای لاکان لە تێپەڕاندنی دەسەڵاتی فۆکۆیی شیاوتر و ئاسانترە «ژیژک. ٢٠٠٥. ١٥»

بەبێ گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لاکان و هیگڵ ڕاڤەکردنی تێزەکانی ژیژک ئاسان نییە، لە نوسینەکانی دیکەشدا بەردەوام دەگەڕێمەوە سەر ژیژک، نە تەنیا لەبەرئەوەی گرنگترین فەیلەسوفی زیندووی دونیایە، بەڵکو لەبەرئەوەی یەکێکە لەو فەیلەسوفە کەمانەی بیرکردنەوە لە یاخیبوون و شۆڕش دەکاتەوە بەبابەتی گرنگی فەلسەفە. ئەو یەکێکە لەو فەیلەسوفە کەمانەی بە ڕۆحێکی هیگڵیانە شەڕ لەگەڵ دەرکەوتەکانی پۆستمۆدێرنە و گلۆبالیزمدا دەکات، لێرەوە بایەخە فیکرییەکەی بۆ دونیای ئەمرۆ بێوێنەیە.

ئەو تێزە بنەڕەتییەی کە سیستم ناتوانێت هەموو شتێک کۆنترۆڵبکات و هەمیشە ڕەگەزێک دەمێنێتەوە کە یەکانگیری و جێگری و گشتگیری تێکدەدات، وادەکات ئەگەری تێپەڕاندنی سیستم ئەگەرێکی هەمیشەیی بێت. ئەم تێزەیە لە هەندێک ڕووەوە نزیکە لە تێڕوانینەکانی «ئەرنستۆ لاکلاو» دا سەبارەت بە «نەبوونی کۆمەڵگا». کۆمەڵگا هەمیشە یەکەیەکی ناکۆکە کە ناتوانێت هەموو بەشەکانی خۆی کۆبکاتەوە... لێرەوە سیستم چەندە بیەوێت تۆتالیتار و گشتگیر بێت هەمیشە ڕەگەزێک هەیە کە درزی تێدەکات و لەناوەوە ڕایدەتەکێنێت.

سیستم هەمیشە لەسەر ناکۆکی بەندە، بە بوونی ڕەگەزێکی نهێنی و

ناوەکیدا دەناسرێتەوە کە لەسەرەتاوە بە «ڕۆحییەتی گۆڕان» ناومبرد. ڕۆحییەتی گۆڕان ئەو ڕەگەزە تێکدەرەیە کە ناهێڵێت سیستم بگاتە کەماڵی خۆی، ئەم ڕۆحییەتە لە مێژووی فەلسەفەدا هەرجارەی لە ژێر ناونیشانێکدا دەگەڕێتەوە و دەردەکەوێت، لای هیگڵ لە وێنەی «نەفی ـ تاراندن» دا دەردەکەوێتەوە، لای مارکس لە شێوەی «پرۆلیتاریا» دا دەبینرێت، لای بلۆخ ناوی «ئەوەی هێشتا نەبووە»یە، لای دێریدا ناوی «نەگەر ـ مستحیل» ـە، لای والتەر بنیامین ناوی «وەستاندنی دیالەکتیکییە»، لای جۆن هالۆوەی ناوی «دووبارەنەکردنەوەی سیستم»ـە، لای لاکان ناوی «بابەتی ئەلف» ـە کە بۆی دەگەڕێین و نای گەینێ، لای فۆکۆ ناوی «بابەخدان بەخود» ـە، لای ژیژیکیش گەڕانەوەی بەردەوام و بیرخستنەوەی بەردەوامی هەموو ئاماژە و نیشانە و تێکچوون و ناتەباییەکانی ناو سیستمە و پێداگرتنێکی گەورەیە لەسەر جەوهەری ئەنتاگۆنیستی هەموو سیستمێک. بەڵام بە کۆ ئەم دیاردانە چەمکگەلێکمان دەدەنە دەست کە گرنگن بۆئەوەی تێبگەین، کە دەکرێت بە چەمکگەلێکی زۆری لە بابەت «خەون، نەگەر، یۆتۆپیا، دووبارەنەکردنەوە، بەرگری» دژ بە وێنەیەکی ئەبەدی بۆ سیستم و شتەکانی بوەستینەوە. تێپەڕاندنی سیستم لە یەک کاتدا نامومکینە کە بیر لە تێپەڕاندنی نەکەینەوە، کە ئەو چەکانەی هەمانە نەیانخەینە گەڕ، ئەو موستەحیلانەی دەوریانداوین لە خەونیان هەڵنەستێنین، کە سوبێکت وەک یەکەیەکی گۆڕاو و خۆدروستکەر نەبینین، کە نەمانەوێت لە پرۆسەی بە ئۆبێکتبوونی سوبێکت دەرچین. ڕۆحییەتی سیستم کاتێک لە سنوورەکانی خۆی تێدەگات کە ئێمە لە ڕێگای ئیرادەی خۆمانەوە، بیریبهێنینەوە. ڕۆحییەتی گۆڕان ئامادەگییەکی شاردراوە و ئەنتۆلۆژی و ناوەکییە، چ لە ناو سوبێکت و چ لە ناو ئۆبێکتدا، چ لە ناو تاک و چ لە ناو کۆمەڵدا، ئەوەی گرنگە ئەو ئامادەگییە نهێنی و ناوەکییە

نەچەپێنرێت، ئەو تاریکییە ناوەکییە دەربخرێت و دەربخرێتەوە. ئەوەی گۆڕان دەکوژێت، جیاکردنەوەی گۆڕانە لەسەرچاوە نادیار و تاریکەکانی لە ناو خود و مێژوودا... سیستم لەسەر کۆکردنەوەی هەموو پارچەکان دەژی، لەسەر دروستکردنی لەشێکی خەیاڵی دەژی کە دروستنابێت. هەرکاتێک دەستبەرداری ئەو خەیاڵەش بوو لەوە دەکەوێت سیستم بێت، هەر کاتێکیش تەسلیمی ئەوە بوو کە خەیاڵەکەی مەحاڵە، ئەویکاتیش دووبارە لەوە دەکەوێت سیستم بێت. لێرەوە خودی سیستمیش لەسەر مەحاڵێک بونیادنراوە... ئیشی ئێمەش ئەوەیە هەمیشە ئەو مەحاڵەی وەیاد بهێنینەوە.

# سەرچاوەکان

Jacques Derrida. Politik der Freundschaft. Suhrkamp. Frankfurt/ M. 2001.

Rolf Jucker (Herausgeber). Zeitgenössische Utopie entwürfe in Literatur und Gesellschaft. Zur Kontroverse seit den achtziger Jahren. Editions Rodopi B.V. 1997

Ernst Bloch: Das Prinzip Hoffnung. Gesamtausgabe Bd. 2 .Frankfurt/M. 1969.

Inge Münz-Koenen. Konstruktion des Nirgendwo. Akademie Verlag. 1997

Manfred Klein. Heimat als Manifestation des noch-nicht bei Ernst Bloch. Grin Verlag.2008.

Jiyoung Shin, Chi- yŏng Sin. Der bewußte Utopismus im Mann ohne Eigenschaften von Robert Musil .Konigshausen & Neumann .Würzburg . 2008

John Holloway. Die Welt verändern ,ohne die Macht zu übernehmen. Westfälisches Dampfboot. Münster. 2002

Uwe Backes. Gefährdungen der Freiheit. Extremistische Ideologien im Vergleich. Vandenhoeck & Ruprecht.

Göttingen .2006

Janine Böckelmann . Politik der Gemeinschaft: Zur Konstitution des Politischen in der Gegenwart. Transcript. Bielefeld .2008

Roland Anhorn , Frank Bettinger, Johannes Stehr (Hrsg.) Foucaults Machtanalytik und soziale Arbeit. Vs Verlag .Wiesbaden. 2007

Stephan Moebius, Dietmar Wetzel (Hersg.) Absolute Jacques Derrida. Freiburg. OrangePress.2005

Michael Maset .Diskurs, Macht und Geschichte, Foucaults Analysetechniken und die historische Forschung. Campus.2003

Jürgen Martschukat. Geschichte schreiben mit Foucault.Campus.2002

Michel Foucault. Die Maschen der Macht. In: Schriften. Vierter Band. Frankfurt/M. Suhrkamp. 2005

Fernando Suárez Mülle. Skepsis und Geschichte. Das Werk Michel Foucaults im Lichte des absoluten Idealismus. Königshausen & Neumann. Würzburg 2004

Slavoj Zizek. Die Tücke des Subjekts .Suhrkamp. Frankfurt/Main.2001

Slavoj Zizek. Die Politische Suspension des Ethischen. Suhrkamp. Frankfurt/Main.2005

# سێوی سێهەم

## دەربارەی گووتار و جیاوازی

## «خوێندنەوەیەک بە کۆمەکی ئەرنستۆ لاکلاو و شانتال مۆڤ»

نوکتەیەکی کۆن هەیە دەڵێت «کەسێکی برسی لە ژوورێکدا دەبێت. ئەو سێ سێوی پێیە، سێوی یەکەم لەتدەکات و دەبینێت کرمێیە، سێوی دووهەم لەتدەکات و دەبینێت کرمێیە، بۆ سێوی سێهەم گڵۆپەکە دەکوژێنێتەوە و ژوورەکە تەواو تاریکدەکات و دەستدەکات بە خواردنی».

ڕەنگە ئەم نوکتەیە ئاماژەیەکی گرنگی تێدابێت بۆ تەواوی دۆخی مرۆڤ و تراژیدیاکەی لەسەر زەوی، بە بڕوای من دۆخی ئەم مرۆڤە تەنیا ئاماژە نییە بۆ کەسێکی تەنیا لە ژوورێکدا، بەڵکو ئاماژەیە بۆ دۆخی وجودیانەی مرۆڤ لەسەر زەوی. ئەی ئەوە مرۆڤ نییە کە جار دوای جار فۆرم و شێوازی کۆمەڵایەتی جیاواز تاقیدەکاتەوە، ئەی هەر ئەو نییە بەدرێژایی مێژوو لە بەردەم ئەزموونکردنی مۆدێلی نادیاردایە، ئاخۆ ژیانی فەردی و کۆمەڵایەتی ئێمە پڕ نییە لەو سێوی سێهەمە کە چراکانی بۆ خامۆشدەکەین بۆئەوەی بیخۆین؟. پرسیارەکەی من لێرەدا ئەوەیە: ئاخۆ دەکرێت ئەم نوکتەیە بەجۆرێک بخوێنینەوە، دەروازەیەکمان بداتێ، ئەوەک بۆ تێگەیشتنی بارودۆخی ئەو کەسەی لە ژوورەکەدا سێوەکان دەخوات، بەڵکو بۆ خوێندنەوەی ئەو هەلومەرجە گشتییەی ئابلۆقەی

هەموو بڕیارێک لە کایەی کۆمەڵایەتیدا دەدات؟. سێوی سێهەم نوێنەری ساتەبڕیارێکی سەختە، گەیشتنی دوو ئەگەری سەرەکی و دوو هەڵبژاردنی گەورەیە بە بونبەستێکی تەواوەتی، واتە هەرەسی دوالیزمێکی گەورە و سەرهەڵدانی ئەگەرێکی دیکەیە کە هێشتا بەوردی نازانین چییە، واتە ماهییەتە مێژووییەکەی بە تەواوەتی تاقی نەبۆتەوە، بەڵام بەبێبوونی ئەو سێوەش ئەستەمە بتوانین هەنگاوێک بڕۆینە پێشێ. ئەوانەی کە پێشوەخت بەسەر مێژوودا بازدەدەن و قسە لەسەر ماهییەتی سێوەکە، یاخود ئەگەرە مێژووییەکە دەکەن، هیچ نین جگە لە کۆمەڵێک فاڵچی. ئەوەی ڕاستەوخۆ شوناسێکی ئامادە دەبەخشێتە سێوەکە، ناوێکی بەسەردا دەبڕێت، شوناسی دیموکراسی، یان فریادەرەس یان فاشی پێوەدەلکێنێت، هیچ شتێک لەو ڕاستییە نازانێت کە گرنگی سێوەکە لەوەدا نییە کە چییە، بەڵکو لەوەدایە کە هێشتا نازانین چییە. واتە نوێنەری «دۆخێکی پڕ ئەگەرە»، نوێنەری دۆخێکە ئاشکرا نییە چی لێ سەوز دەبێت. بۆیە گرنگە هەر لەسەرەتاوە بڵێم هەموو ناونانێکی سێوی سێهەم «یاخود ئەگەری سێهەم» دەبێتە ناونانێکی ئایدۆلۆژی، گەر بێت و ئەوە ڕەچاونەکات شوێنی ئەگەری سێهەم و مانای ئەم ئەگەرە لە تەواوی سیستمی گووتاردا چییە. بەوەشدا هەموو ناونانێک لە جەوهەردا ناونانێکی ئایدۆلۆژییە، هەوڵی گەورەی ئەم وتارە پاراستنی سێوی سێهەمە لە هەر ناونانێک، واتە گەر بە زمانێکی ژیژیکی و لاکانی قسەبکەم، نیاز لەم سەیرکردنە مامەڵەکردنی ئەگەری سێهەمە وەک دەلاقەیەک کە پڕنابێتەوە، وەک درزێکی هەمیشەیی، وەک دەرکەوتەیەک لە دەرکەوتەکانی «ڕیال»... واتە وەک سێوێک هەتا دوای خواردنیشی هەمیشە ئامادەیە و سەوزدەبێتەوە و خۆی دووبارەدەکاتەوە.

ئەو کەسەی کە لە نوکتەکەدا سێوی سێهەم دەخوات، دەیتوانی ماهییەتێکی پێشوەخت و دەلالەتێکی کۆنکرێت بدات بە سێوەکە، واتە

دەیتوانی نەیخوات، یاخود دەیتوانی بیخوات بێئەوەی گڵۆپەکە بکوژێنێتەوە و ڕوناکییەکە خامۆشبکات. واتە دەیتوانی بەدرۆ دڵنیاییەک ببەخشێتە خۆی و بڵێت ئەم سێوە، سێوە ساغ و دروست و بێخەوشەکەیە، یاخود سێوەکە بەتەواوی لە گەمەکە دووربخاتەوە و وەک ژەهرێکی دی مامەڵەی لەگەڵدا بکات و فرێیبدات و بەوە ڕازیبێت کێشەکەی لەگەڵ سێوی یەکەم و سێوی دووهەمدا چارەسەربکات. بەڵام ئەوەی ڕوناکییەکە خامۆشدەکات و سێوەکە دەخوات، دەلالەتێکی ئێجگار گرنگی هەیە... دەلالەتی تێکەڵبوون بە تاقیکردنەوەیەکی گرنگ و پێویست و بزاڤساز، ئەزموونی مامەڵەکردن لەگەڵ نادیاردا، ئەزموونێک پێشوەخت ماهییەتەکەی دیاری نەکراوە، خواردنی سێوەکە ئاماژەیەکی ڕەمزییە بۆ کرانەوە بەسەر نادیاردا، ئاماژەیە بۆ ئەو دەلاقە قووڵەی کە پێویستە هەبێت بۆئەوەی بتوانین لە هەر سیستمێک دەرچین. لە ئاستی مێژوویدا باوەڕهێنان بە ماهییەتی ڕەها و ڕۆشن هەمیشە ترسناک دەکەوێتەوە. ئەو هێزانەی شوناسی ڕوونیان هەیە، ترسناکن، یاخود هەموو ئەوانەی باوەڕیان وایە کە بە ڕوونی شوناسی هێزێک دەبینن، ترسناکن. چونکە لە ئاستی مێژوویدا شوناس هەمیشە دەمامکە... هەمیشە پەردەی شتێکی دیکەیە... نەوەک لە بەرئەوەی، ئەوەی لە «دیار» و «بینراو»دا دەردەکەوێت شتێکی دییە جیاوازە لەوەی کە لە «نادیار» دا هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی هەر هێزێک شوناسێکی زۆرەملێ و خۆسەپێن ببەخشێتە خۆی، شوناسێکی زۆرەملێ و خۆسەپێنیش دەبەخشێتە ئەوانی تر. هیچ هێزێک نییە ماهییەتێکی هەمیشەیی هەبێت، بەدرێژایی مێژوو و لە هەموو ئاست و سات و ڕەوتەکاندا هەمان ئاکار و بەها و مۆراڵی هەبێت. لە سیاقە جیاوازەکاندا هێزە جیاوازەکان، مانای جیاوازیان لای ئێمە هەیە. لێرەوە گرنگی سێوی سێهەم «یان ئەگەری سێهەم» لەوەدایە کە بە جۆرێک لە جۆرەکان دەمانباتەوە بۆ ساتی پێش ناونان... بۆ جێگایەک شوناسی هێزەکان بە

روونی دیارنین، بۆ ساتێک سێوەکە تێیدا دەکەوێتەوە پێش پۆلێنی سێو بۆ چاک و بۆ کرمی. گرنگی سێوی سێهەم لەوەدایە کە شوناسی نییە، واتە ئەوەی لە سێوەکەدا گرنگە ئەوە نییە کە نازانین چییە، بەڵکو نەبوونی شوناسە. سێوەکە ئاماژەیە بۆ سێو بەر لە باش و خراپ، بۆئەو خاڵە سپێتییەی کە دەکەوێتە دەرەوەی هەموو پێناسەیەکەوە، ئەو خاڵەی کە گرنگە بۆ دەستکردنەوە بە هەر پرۆسەیەکی نوێی پێناسەکردن.

لە ناو مێژوودا دەبێت هەمیشە هێزێک هەبێت کە بەدروستی تێینەگەین، واتە نەتوانین بەدروستی ماهییەتی دەستنیشانبکەین، واتە نوێنەری دیوە تاریکەکەی مێژوو بێت، نوێنەری ئەو ئەگەر و شیمانە تاریک و نادیارانە بێت کە لە ڕۆحی چرکەساتەکەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام نابێت بە هەڵەدا بچین و ئەو هێزە وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی بەرجەستە و دەستنیشانکراو ببینین، بەڵکو ئەو هێزە هێزی هەمیشەیی ئەگەرە نادیارەکانە کە لە پشت هەموو چرکە و هەموو وێستگەیەکی مێژووییەوە ئامادەیە. لە ڕاستیدا هێزە کۆمەڵەیەتییەکان دەتوانن ئیش بەم نادیارە بکەن، بەڵام هیچ هێزێک ناتوانێت داگیریبکات و پڕیبکاتەوە، چونکە وەک چاڵێکە هەر کات پڕکرایەوە، لە هەنگاوی داهاتوودا دووبارە دروستدەبێتەوە. دیارە لە ڕەوتی هەڵبژاردنی مێژوویدا ئێمە سەروکارمان لەگەڵ هێزگەلێکدا نییە کە هەموو پێکڕا هوشیاری تایبەتی و پڕۆژەی ڕوونی بۆ مێژوو هەبێت، بەڵکو سەروکارمان لەگەڵ چەند هێزێکدایە کە هەندێکیان ئەگەری مێژوویی خۆیان تاقیکردۆتەوە و ئەوانی دی نەیان کردوە، هەندێکیان باڵادەستی خۆیان بەسەر سیستەمدا تاقیکردۆتەوە و بڕێکی زۆر لە توانا ناوەکییەکانی خۆیان نیشانداوە و ئەوانی دی هێشتا لە تاریکیدان، بەڵام ئەو هێزانەی لە تاریکیدان هێندەی ئاماژە بۆ ئەو ئەگەرە نادیار و ئەزموننەکراوەی ناو مێژوو دەکەن، ماهییەتی ئەو ئەگەرە دیاری ناکەن. سێوی سێهەم هەرچییەک بێت

ئامارژەیە بۆ ئەگەرێکی هەمیشەیی و کراوەیە. بەبڕوای من هەموو ئەوانەی کە بوار بۆ ئەو ڕەگەزە نادیارە ناهێڵنەوە، بە پێناسەی پێشوەخت و ناونانی پێشوەخت دەیکوژن، ڕەنگێکی ئایدۆلۆژی پێشوەختی بەسەردا دەڕێژن، ئەوانەن کە پێیانوایە زانینێکی هەمەلایەنە و فرەگیر و گشتیان دەرهەق بە مێژوو هەیە. فاشییەت تەنیا دەسەڵاتی موتڵەق نییە، بەڵکو زانینی موتڵەقیشە، فاشییەت تەنیا کۆنترۆڵکردنی موتڵەق نییە، بەڵکو بانگەشەی تێگەیشتنی ڕەها و بینینی ڕەها و ناونانی ڕەهاشە.

بۆ کەسە سێوخۆرەکە چراکە خامۆشدەکات، بۆ بەرەو دەرەوەی ڕوناکیمان دەبات، بۆ تاریکی گرنگە بۆئەوەی بتوانین سێوەکە بخۆین. ئایا توانای خواردنی سێوەکە پابەندی توانای دروستکردنی تاریکییە؟. بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، دەبێت هەندێک تێڕوانینی سەرەتایی لەسەر تاریکی ناو ژوورەکە بخەمەڕوو. تاریکی وەک جێگایەکی نادیار کەدەکەوێتە دەرەوەی زانراو وتراوەوە، شوێنێکی ستراتیژی گرنگ لە کۆی پرۆسێسی گۆڕاندا نیشاندەداتەوە، لێرەوە ساتی خامۆشکردنی چراکە تەنیا گرنگترین ساتی ناو نوکتەکە نییە، بەڵکو گرنگترین ساتی پرۆسەی بەردەوامی توانای ئیشکردن و هیواشە، ئەو خاڵەیە کە دەتوانین وەک «نەفی دەستنیشانکراوی» هیگڵی ناویببەین، کە ژێژیک بەسەرچاوەی سەرهەڵدانی شتێکی دی، شتێکی تەواو جیاواز لەوەی کە هەیە لەقەڵەمیدەدات.

بۆ ئەوەی تێبگەین بۆ خامۆشکردنی چراکە بەو ئەندازەیە گرنگە، دەبێت شتگەلێکی گرنگ دەربارەی خودی سیستم و ئیشکردنی بزانین، ئایا خامۆشکردنی چراکە ترسە لە جەوهەری سێوەکە یاخود ئامارژەیەکی مەجازییە بۆئەوەی کە ئەم سێوەیان جودا لە دوو سێوەکەی تر جەوهەری نییە... ئایا ترسە لە سێوەکە یاخود ڕاگەیەندنی ئەوەیە کە هەر لە بنەوەڕا ماهییەتی ئەم سێوە گرنگ نییە، چونکە ماهییەتی نییە؟.

بۆ ئەوەی تەواو لەم کێشەیە تێبگەین نیگایەک لە تێڕوانینەکانی ئەرنستۆ لاکلاو و شانتال مۆڤ دەکەین کە لە ڕوونکردنەوەی مانای سێوی سێهەمدا دەتوانن کۆمەکێکی بەرچاومان پێبکەن. ئەوان لە کتێبە گرنگ و ناودارەکەیاندا «سالارگەرایی و دیموکراسیەتی ڕادیکال» هەڵوێستەیەکی توند دژ بە ڕۆحی «جەوهەرگەرایی» ناو مارکسیزم وەردەگرن. هەر تێزێکی جەوهەرگەرا کە پێیوایە کۆمەڵگا لە ڕێگای یەک ڕەگەزەوە دەخوێنرێتەوە و نهێنییەکانی ڕۆشندەبێتەوە، یاخود پێیوایە هێزگەلە کۆمەڵایەتییەکان وەزیفە و پەیام و شوناسێکی جەوهەرییان هەیە... لەگەڵ خۆیدا شوناسی نەگۆڕ و نێوکۆیی «سیاق»ـی کۆمەڵایەتی نەگۆڕ دروستدەکات. جەوهەرگەرایی بریتییە لە پیشەسازی دروستکردنی شوناسی ڕۆشن و دیار و یەک ڕەهەندە بۆ شتەکان، واتە بەخشینی جەوهەرێکی ئاشکرا و ماهییەتێک کە دەزانین چیمان لێدەوێت و چی لێ چاوەڕواندەکەین. ئەو تەفسیرەی کە پێیوایە دەتوانێت تەواوی پرۆسەی کۆمەڵایەتی لە کۆنسێپت و تەفسیری ڕۆشندا بخوێنێتەوە، مەیلی لە بەخشینی ناوێک و چۆنییەتییەکی هەمیشەییە بە شتەکان، واتە جۆرە ناونان و چۆنێتیسازییەکی وەهایە کە لەدوا دەرەنجامدا سیستمێکی داخراو دروستدەکات. لێرەوە وشەی ڕوناکی لە سیاقی کارلێکی مێژوویدا دەبێتە ڕەگەزێکی نەگەتیڤ، ئەوەی پێمان وابێت کە دەتوانین ماهییەتی نەگۆڕ و پەیامی ئەبەدی شتەکان ببینین و دەتوانین بێ هیچ دوودڵییەک لە نێوان باش و خراپ، کۆن و نوێ، ڕاست و هەڵەدا جیاکاریبکەین، جۆرە دڵنیاییەک و ئاسوودەییەک دەخولقێنێت، کە سیستم بەرەو داخستن دەبات. فیکری دۆگمائی لە زۆربەی مۆدێلەکانیدا لەسەر ئەفسانەیی ڕۆشنی بینین و بەرچاو ڕوونی ڕەها بونیادنراوە، وەک چۆن ئیماندارێکی ڕاستەقینە ناتوانێت «بیر لە نەبوونی خودا» بکاتەوە، مارکسیستێکی دۆگماییش ناتوانێت دابەشبوونی دونیا لەدەرەوەی هەرەمی چینایەتی

بخوێنێتەوە، ئەم دوو کەسە هەر دووکیان دڵنیان کە ڕۆشنی موتڵەق و ڕوناکییەکی تەواویان لە بەردەستدایە بۆئەوەی ژیان و یاسا و ڕێساکانی بە ڕوونی ببینن. ئەو تیرۆریستەی کە خۆی دەتەقێنێتەوە کوشتەی ڕوناکییە، کوشتەی ڕۆشناییەکی موتڵەقە کە هەموو شتێکی وەها بۆ ڕۆشندەکاتەوە، ئیدی گومانێکی دەرهەق بە شوێنی مەرگی خۆی لە ناو سیستەمەکەدا لا نامێنێت، دڵنیایە مەرگی خۆی لە ناو سیستەمی گەردوندا دەچێتە کوێوە، دڵنیاییە لەشی خۆی لە کوێوە دێت و بۆ کوێ دەڕوات، دڵنیاییە ئەو لە چ خانەیەک و ئادەمیزادەکانی تر لە چ خانەیەکی دیدان، تیرۆریست مەخلوقێکی ڕوونبینە، سێوە کرمێکە دەخوات بەڵام پێیوایە ئەوە تاکە سێوێکە دەیباتە بەهەشت. مرۆڤی جەوهەرگەرا پێیوایە ئەو پێشوەخت ماهییەتی سێوەکە دەبینێت و دەتوانێت بزانیت ناوەکەی چی تێدایە، واتە پلەی یەقینی لە ئاستێکدایە کە دەتوانێت بەرلەوەی سێوەکان لەتبکات، بیانخوات یان فڕێیانبدات... هەموو سێوەکان. تاریکی ژوورەکە لە جەوهەردا نیشانەی خۆنەگونجاندنە لەگەڵ سیستەمی ناونان و ناسینی پێشووتردا، نیشانەی ڕەتکردنەوەی ئەو ڕۆشناییەیە کە شوناسێکی ڕەها بەشتەکان دەبەخشێت، واتە تاریکی ژوورەکە دەرچوونیە لە ڕۆشنایی و ناونانە دێرینەکان.

لێرەوە ڕاستی یەکەم کە لەسەر کەسە سێوخۆرەکە دەستماندەکەوێت، ئەوەیە کەسێکی ئیماندار نییە، کەسێکی دۆگمائی نییە، سەرەتا سێوەکان لەتدەکات و تەماشایاندەکات و تاقیاندەکاتەوە، کەسێکی ئەزموونگەرە، پێی وانییە کە هێزێکی ناوەکی و یەقینێکی دەرونی ڕێگای بۆ ڕووندەکاتەوە بتوانێت پێش لە کەرتکردنی سێوەکان ماهییەتەکەیان ببینێت، ئیدیعای ئەوە ناکات کە حەقیقەتی لایە، بەڵام خامۆشکردنی چراکە گەیشتنی ئەو ڕۆحە ئەزموونگەرەیە بە بونبەست، هەستکردنی ئەو ڕۆحەیە بە بوونی دەرگایەک کە بەرەو ئەودیوی ئەزموونی دەبات، واتە دەزانێت کە

ئەوە چرکەساتی گواستنەوەیە لە ئەزموونکردنی شتێکی دیارەوە بەرەو ئەزموونکردنی شتێکی دی نادیار. سیفەتی سەرەکی مەعریفە ئەوەیە کە هەمیشە مەعریفەیەکی نوقسانە، لێرەوە ئەوەی کەسی سێوخۆر سێوێک دەخوات کە تەواو دڵنیا نییە لێی، بەجۆرێکی ڕەمزی و نوێ تەنیا چیرۆکی ئادەم لە بەهەشتدا دووبارە ناکاتەوە، کە ئەویش سێوێک دەخوات نازانێت چییە، بەڵکو ئەو دۆخە وجودییە دووبارەدەکاتەوە کە تێیدا مەحکومین بە کەلێنێک و بە درزێکی ئەبەدی لە زانین و زانستەکانماندا. چ سێوەکەی ئادەم، چ سێوەکەی نیوتن کە ئامازەیە بۆ هێزێکی نادیار کە لە پشت هەموو سیستمێکەوەیە، تا دەگاتە سێوەکەی سیزان کە ئامازە بۆ ئەگەرە ناکۆتاکانی فۆرمی شێوەکاریی دەکات، چ سێوی کەسە سێوخۆرەکەی ناو نوکتەکە، هەموو ئامازەن بۆ ئەو درز و کەلێنەی لە ناو هەموو سیستمێکدا هەیە و تەواوی ڕێکی و ناڕێکی، ونبوون و خۆدۆزینەوە، جێگیری و پەشێوی نێو شتەکانی لەسەر بەندە.

ساتی کوژاندنەوەی چراکە ساتی ونبوونی عەقڵ نییە، بەڵکو ئەو ساتەیە کە تێیدا دەڵێین «چیرۆکەکە لێرەدا کۆتایی نەهاتووە»، دوو سێوە کرمێکە هەموو شتێک نین و هێشتا ئەزموونێکی دیکە هەیە بیکەین و هەوڵێکی نوێ هەیە بیدەین، واتە سێوێکی سێهەم هەیە، چاوەڕێی تاقیکردنەوە و ئەزموونە.

سێوی سێهەم لێرەدا ئامازەیەکی سەمبولییە بۆ ئەوەی کۆی سیستمەکە « کە لێرەدا ڕوناکی ژوورەکەیە» ناتوانێت هەموو شتێک لە خۆیدا کۆبکاتەوە، ناتوانێت ئامێز بە هەموو شتێکدا بکات.

بۆئەوەی پتر لە ماهیەتی ئەم تاریکییە تێبگەین، دەبێت سەرەتا بە کورتی تێڕوانینی ئەرنستۆ لاکلاو و شەنتال مۆف دەربارەی گووتار بخەمەڕوو، چونکە بەبێ تێگەیشتن لەو تێڕوانینە ئەستەمە هەندێک سیفەتی ئەگەری سێهەم و بنەما تیورییەکەی لە کۆمەڵناسی نوێدا

تێبگەین. مارکسیزمی تەقلیدی بەوەدا ئیدیعای ئەوەدەکات لە ڕێگای تیورەی حەتمییەتی ئابوورییەوە دەتوانێت هەموو کۆمەڵگا ڕوناکبکاتەوە و هەموو مێژوو بخوێنێتەوە، وێنەیەکی کۆمەڵگامان دەداتێ کە ستراکتورێکی داخراوی هەیە، کە جوڵەیەکی ئامانجداری هەیە و ڕەوتەکەشی هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی دیارە... ئەوەی پێتوابێت مێژووی کۆمەڵگا لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی دەبینیت، وێنەی بونیاد و ڕەوتێکی گەشەی داخراومان دەخاتە بەردەست، لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی هەموو ئەگەرەکان دەبینین، واتە هیچ سێوێکی سێهەم و هیچ چرکەیەکی نادیار و شوناسێکی نەناسراو لەگۆڕێ نییە. بەڵام بۆ دەبێت هەمیشە ئەزموونێکی ناتەواو و ئەگەرێکی دیکە هەبێت تا بتوانین تەواوی هاوکێشەکە لە بەر ڕوناکییەکی دیکەدا ببینین؟. تێڕوانینی لاکلاو و مۆف لەسەر ڕزگارکردنی بونیادەکان لە داخرانی ڕەها بەندە، لای ئەوان پێکهاتی بونیادێک لەسەر لێکچوونی ڕەگەزەکانی ئەو بونیادە دروست نابێت، بونیاد کۆکردنەوەی ئەو شتانە نییە کە لە یەکدەچن، بەڵکو کۆکردنەوەی ئەو شتانەشە کە جیاوازن، بۆئەوەی بونیادێکمان هەبێت، هەموو ڕەگەزەکانی ناو بونیاد لەسەر لێکچوون کۆنابنەوە، بەڵکو لەسەر سیستمێکی دیاریکراوی جیاوازی کۆدەبنەوە، بۆیە لای لاکلاو و مۆف کۆمەڵگا وەک یەکەیەکی هاویەک بوونی نییە، ئەوەی هەمانە سروشتێکی ئەنتاگۆنیست و پڕ ناکۆکی ناو دۆخی کۆمەڵایەتییە. لاکلاو و مۆف پێ لەسەر ڕوخساری ئەنتاگۆنیست و ناڕێک و زبر و پڕ بەرز و نزمی ئەو جێگایە دادەگرن کە ئێمە بە کۆمەڵگا ناوی دەبەین. لای ئەوان کۆمەڵگا شوێنی خڕبوونەوە و ڕیزبوونی گووتارەکانە، گووتاریش بریتییە لە پێکهاتێک بە فۆرمێکی نیمچە داخراوەوە و لە ئەنجامی «خۆبەیانکردن و خۆڕێکخستن و دەربڕینی» « Artikulation» پراکتیکە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەرهەمدێت. هەموو سیستمێک بەبڕوای ئەوان سیستمێکە لە جیاوازی، لە زنجیرەیەک خۆجیاکردنەوەی ناوەکی و

دەرەکی، واتـە چ لـە نـاو خۆیـدا جیابوونـەوە و دابەشبوون هەیـە و چ لەگـەڵ دەرەوەشـدا. بـەڵام بـە بـڕوای لاکلاو و مۆف جیاوازییەکی ئەبەدیی و نەگۆڕ و چەسـپاو بوونـی نییـە، جیاوازییـەکان دروسـتدەبن، شـێوە وەردەگـرن، خۆیـان بەیاندەکـەن و ونیشـدەبن. جیـاوازی هەمیشـەییە، بـەڵام سیسـتمێکی داخـراوی جیـاوازی بوونـی نییـە، کـە ئەمبـەرە و بـەری جیاوازییەکـە تێیـدا جەوهەرێکـی نەگۆڕیـان هەبێـت و گۆڕانیـان بەسـەردا ڕوونـەدات. بـۆ ئـەوەی کارلێکـی کۆمەڵایەتیمـان هەبێـت، دەبێـت لـە نێـوان دەرەوە و نـاوەوەدا هەمیشـە پەیوەندییەکـی لـەرزۆک و کارتێکردنـی بـەردەوام هەبێـت، نـەوەک سـەنگەرگیری و شـەڕکردن لـە پشـت دیـواری ئەسـتوورەوە. بـە بـڕوای ئـەوان «پرەنسـیپێک» نییـە تـەواوی جیاوازییـەکان بەجۆرێکـی هەمیشـەیی لەسـەر یـەک فـۆرم بچەسـپێنێت. « لاکلاو، مـۆف. ١٤٨» . لـە تێزەکـەی ئەوانـدا «کۆمـەڵ» لـە ژمارەیەکـی زۆر و نادیـار لـە جیاوازیـی و ئەگـەری جیاوازیـی دروسـتدەبێت، ئـەو سـاتانەی جیاوازییـەکان تێیـدا دروسـتدەبن لای ئـەوان بـە «سـاتەوەختەکان Momente» ناودەبرێـن، بـەڵام ئـەو جیاوازیانـەی کـە دەرنەکەوتـوون بـە «کەرەسـتە Element» ناودەنێـن. کەرەسـتە ئاماژەیـە بـۆ ڕسـتێک جیـاوازی کـە هێشـتا نەهاتوونەتـە سـەرێ و دەرنەکەوتـوون. بـەڵام ئەمـە مانـای چـی گـەر بڵێیـن جیاوازییـەکان هەمیشـە دەگۆڕێـن و جیـاوازی نوێـش هەمیشـە لـە ڕێگادایـە بـۆ سـەرهەڵدان و لەدایکبـوون؟ واتـە هیـچ ڕەگەزێـک تەنهـا لـە خۆیـەوە مانـا وەرناگرێـت، هـەر ڕەگـەزە و واتـای خـۆی لـە نـاو سیسـتمی جیاوازییـەکان و بەپێـی پەیوەنـدی بـە جیاوازییەکانـی دییـەوە وەردەگرێـت، مانـای هیـچ شـتێک سـەربەخۆ و ئـازاد بـە خۆیـەوە نەبەسـتراوە، دەلالەتـی هیـچ شـتێک لـە خۆیـەوە هەڵناقوڵێـت، بەڵکـو لـە پەیوەندیـدا بـە ڕەگەزەکانـی دیکـەی نـاو سیسـتمەوە مانـای هەڵدەقوڵێـت. بـۆ نمونـە : لـە کۆمەڵگایەکـی وەک ئێمـەدا جیـاوازی نێـوان هەمـوو گروپێـک، هەمـوو جـۆرە گووتارێـک لـە ڕێـگای هێڵکێشـان و سـنووردانانێک لەگـەڵ

دەرەوەدا، لەگەڵ دژەکەیدا دروستدەبێت. بۆ ئەوەی «دڵسۆز» و «خائین» لە یەک جیابکەینەوە، «نیشتیمانپەروەر» و «دوژمن» لە یەک جیابکەینەوە، پێویستیمان بە هێڵکێشییەک و سنووربەندییەک هەیە کە نیشتیمانپەروەران و دڵسۆزان لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا دەیکێشن، ئەوەی گووتارەکە دەسازێنێت خودی ئەو هێڵکارییە و هێلسازییەیە کە ناوەوەی گووتار لەگەڵ دەرەوەدا جیادەکاتەوە، ئەوەی گرنگە ئەم هێڵی جیاکردنەوەیە نەبزۆک و هەمیشەیی و نەگۆڕ نییە. هەموو گووتارێک لە جەوهەریدا بە ڕای لاکلاو و مۆف گووتارێکی کراوەیە، واتە سنوورێکی داخراوی نییە، یاخود لە هەموو جەمسەرەکانییەوە ناتوانێت داخراوبێت، بەم مانایە هەوڵی گووتار بۆ داخستنی خۆی و چەقبەستن لە ناو یەک سیستمی دەلالیدا مەحکومە بە شکست. بۆ نمونە: سەردەمانێک لای ئێمە گووتاری خیانەت لەسەر پەیوەندی بە دوژمنەوە بەند بوو، خائین کەسێک بوو لەگەڵ ڕژێمدا سازشیدەکرد، بەڵام هەر خودی گووتاری سازشکردن کاتێک هێزە گەورەکان پێیهەڵدەستان لە خانەی خیانەت دەردەچوو و دەکەوتە خانەی دیبلۆماسییەتەوە. لێرەوە چەندە بمانەوێت مانایەکی نەگۆڕ و کۆنکرێت بدەینە وشەگەلی وەک نیشتیمانپەروەر یان خیانەت بە هەڵەدا دەچین، چونکە مانای ئەم دوو وشەیە بەردەوام لە سیاقە جیاوازەکاندا دەگۆردرێت و دروستدەبێتەوە. لێرەوە خیانەت وەک جەوهەرێکی نەگۆڕ و نیشتیمانپەروەر وەک ئاکارێکی ئەبەدی بوونیان نییە و هەردووکیان لە سیاقێکی دیاریکراو و لەناو سیستمێکی گشتی گووتاردا دەردەکەون. هەردووکیان کراوە و هەردووکیان پەیوەندیان بە شوێنگەیەکی دیاریکراوی ناو کایەی گووتارەوە هەیە. بەڵام گووتار هەمیشە لە ڕێگای پرۆسەیەکی گەورەی سنووردانانەوە دەخولقێت، گووتار هەمیشە لەسەر خۆجیاکردنەوە لە گووتارەکانی دی دەخولقێت، نەوەک تەنیا لە ڕێگای خۆیەوە، واتە چەمکی خیانەت و دڵسۆزی بەرهەمی

جەوهەرێکی نەگۆڕی خۆیان نین، بەڵکو بەرهەمی ڕێکخستنێکی تایبەتی، پرۆسەیەکی «ڕێکخستن و ڕیزبەندی و تەعبیرکردنن»، لاکلاو وشەی « Artikulation» بەکاردەهێنێت، کە لە ڕاستیدا دۆزینەوەی هاوواتایەکی کوردی بۆی کە هەموو ماناکانی بەو چەشنە بدات کە لاکلاو دەیەوێت، زۆر ئەستەمە. لای لاکلاو و مۆف هەر ڕەگەزێک یان کەرەستەیەک پرۆسەی ئارتیکولاسیۆن «یان ئارتیکولەیشن» ـی بەسەردا بسازێت، واتە بکرێت مانایەکی تایبەتی و ڕیزبەندییەکی تایبەتی و جێگایەکی تایبەتی هەبێت، گووتارە. هەرچییەکیش نەچێتە ئەو پرۆسەیەوە دەکەوێتە دەرەوەی گووتار. بەمانایەکی دی دەرەگووتار شتێکە دەرەتەعبیر و دەرە سیستم و دەرە ڕێکخستنیشە. گووتار جیاوازییەکان ناکوژێت، گووتار کورتکردنەوەی جیاوازییەکان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی جیاوازییەکانە، لێرەوە فەیلەسوفی نەمساوی «ئۆلیڤەر مارشارت» ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ لای لاکلاو دەکات کە جیاکارییەتی لە نێوان هەردوو پرۆسەی «ئەرتیکولەیشن» و «ڕیدوکسیۆن ـ Reduktion» دا کە دوو پرۆسەی دژن «مارشارت. ١٨». لە ڕیدۆکسیۆندا جیاوازی نێوان ڕەگەزەکان هەڵدەگیرێت و بەها دەخرێتە سەر خاڵە هاوبەشەکان و شتەکان بۆ ڕووکارە هاوشێوە و لێکچووەکانیان کورتدەکرێنەوە، واتە تیشکۆ دەخرێتە سەر دیوی چوونیەک و وەکیەکی دیاردەکان، بەڵام پرۆسەی ئارتیکولاسیۆندا گووتارسازی بازدان نییە بەسەر جیاوازییەکاندا، بەڵکو پێکەوەڕیزکردن و پۆلێنکردن و هێنانەزمانی جیاوازییەکانە. لێرەوە «ساتەوەخت Moment» ئەو چرکەساتەیە کە تێیدا جیاوازی دەکەوێتە تۆخکردنەوەی سنووری خۆی لەگەڵ دەرەوەدا، واتە لە ئەگەری جیاوازییەوە دەچینە ناو جۆرە ڕێکخستنێکی دییەوە کە واپێویست دەکات، گووتار سنووری خۆی لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا بە ڕوونی بکێشێت، لە «ئەگەری جیاوازیی»ـەوە بگوازێتەوە بۆ جیاوازییەکی ڕاستەقینە و بینراو

و هەست پێکراو.

گووتار خودی ئەو پرۆسەی جیابوونەوە و ڕیزبەندی و شوێنگیرییە گەورەیەیە کە ڕەگەزەکان بەجۆرێکی دیاریکراو و بەپێی سیستمێکی لۆژیکی دیاریکراو ڕێکدەخات. واتە «کەرەستەکان» پێشتر مانایەکی دیاریکراویان نییە، یاخود لە تۆڕێکی چەقبەستووی مانادا دەژین، بەڵام هێندەی دەبنە گووتار، دەکەونە ناو تۆڕێکی جوڵاو و ناجێگیر و کراوەوە کە ماناکەیان قابیلی گۆڕانێکی جەوهەری و گرنگە، چونکە چیتر مانای شتەکان بە خۆیانەوە نابەسترێتەوە، بەڵکو بەپێی پەیوەندیان بە جیاوازییەکانی دییەوە مانا وەردەگرن و واتایان بەپێی پەیوەندییەکانیان دەگۆڕدرێت. بۆ نمونە ئەو ڕەفتارانەی دەکەونە ژێر خانەی ئیمان یاخود کوفرەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دی و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دی وەک یەک نین، دەشێت لە شوێنێکدا و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یەکێک لەو مانا و ڕەفتارانە زاڵ بێت، بەڵام ئەم زاڵبوونە ئەبەدی نییە، بۆ نمونە پەیوەندی خۆتەقاندنەوە بە ئیمانەوە تەنیا بە کاریگەری بەردەوامی ڕیزێک گووتاری دی لە ئێستادا دەرکەوتووە، لە کاتێکدا نەدەکرا ئەم مانا و پەیوەندییەی کە ئێستا لە نێوان خۆکوژی و ئیماندا هەیە لە کات و جێ و لە ڕێکخستنێکی دیکەی گووتارەکاندا دروستببێت، لێرەوە ئەو سیستمی گووتارەی مانای ئیمانی لای جووتیارێکی کوردی سەدەی نۆزدە دیاریکردوە، هەمان ئەو سیستمە نییە کە ئێستا مانای ئیمان لای ئەندامێکی قاعیدە لە چیاکانی ئەفگانستان دیاریدەکات، یاخود مانای جنس لای ژنێکی ماڵەوە لە شارۆچکەیەکی بچوکی وڵاتی ئێمە بەرهەمی جۆرە ڕێکخستنێکی گووتارە کە تەواو لەو ڕێکخستن و ڕیزبەندییە جودایە کە مانا دەبەخشێتە جنس لای ژنێک لە شارێکی خۆرئاوادا... لێرەوە مانا هەمیشە لە ژێر ڕەحمەتی ڕێکخستنی گووتار و دووبارە ڕێکخستنەوەیدایە. بەڵام چۆن گووتارێک ماناکانی خۆی دەگەێنێت و خۆی

بەرجەستەدەکات؟ بەڕای لاکلاو و مۆف گووتار بەوە خۆی دروستدەکات کە کۆمەڵێک بیر و ئایدیا و ئەلتەرناتیڤی دیکە دەکاتە دەرەوە و ئەگەری بوون و دەرکەوتنیان دەکوژێت، واتە وانیشانیاندەدات کە نەکردە و نەگونجاو و نامومکینن. مارشارت هەوڵەکەی فۆکۆیاما بە نمونەی ئەو ڕەفتارەی گووتار دەزانێت کە لە بری ڕاگەیاندنی سەرکەوتنی خۆی، پێ لەسەر نامومکینی ئەگەرەکانی دیکە دادەگرێت. فۆکۆیاما لە کتێبی کۆتایی مێژوودا لە ڕێگای نیشاندانی ئەوەی کە مۆدێلی لیبرال ـ دیموکرات ئەلتەرناتیڤی نییە، ئەبەدییەت و سەرکەوتنی ئەم گووتارە ڕادەگەیێنێت. ئەرنستۆ لاکلاو بەمجۆرە ئەو پەیوەندییە دادەڕێژێت و دەڵێت «گووتار دەتوانێت مەرجەکانی بیرکردنەوە لە هەندێک شت، تەنیا لە ڕێگای بیرنەکردنەوە لە کۆمەڵێک شتی دی، دابڕێژێت». «مارشارت.١٤٠». بۆیە تەنیا کاتێک ئێمە لە گووتار تێدەگەین کە سنوورەکەی بزانین، واتە بزانین چی دەکاتە دەرەوە، یاخود وادەکات بیر لە چی نەکەینەوە. هەموو گووتارێک لە جەوهەریدا دەرکردن و بەلاوەنان و تەراندنی کۆمەڵێک ڕەگەزە، ئەو تەراندن و وەدەرنانە سنووری دەرەکی گووتار دیاریدەکات. بەجۆرێک دەکرێت بڵێین کێشەی دەرکردن و ناواخنکردن، وەلاوەنان و جێکردنەوە یەکێکە لە کێشە جەوهەرییەکانی سۆسۆلۆژیا و فەلسەفەی هاوچەرخ. جودیس باتلەر لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ «ئەرنستۆ لاکلاو» دا دەڵێت، کێشەی ناواخنکردن « Inklusivität » زۆر بە کێشەی یەکسانی «Gleichheit» ـەوە بەندە، دیارە لێرەدا مەبەست یەکسانی کۆمەڵایەتییە. بۆئەوەی گووتارمان هەبێت دەبێت هەمیشە شتێک بکەینە دەرەوە، دەبێت ڕووبەرێکی بیرکردنەوە بسڕینەوە، دەبێت نەهێڵین شتێک کە لە تاریکیدا هەیە ببینرێت، واتە لە نێوان خۆمان و ئەگەرەکانی دەرەوەی گووتاردا دیوارێکی ئەوتۆ دروستبکەین کە بۆنی دونیای دەرەوەی گووتار، ڕەنگی ئەگەرە دەرکراوەکان نەگەنە خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئێمە،

واتە گۆڕینی پرۆژەکانی دەرەوەی گووتار بۆ جێگایەکی نەکردە و مەحاڵ. لێرەدا یەکسانی لە نێوان گووتارەکاندا تەواو لە بەیندەچێت، سیستەم هەمیشە لەسەر جیاکردنەوە و دەرکردنی کۆمەڵێک گووتار دروستدەبێت لە پێناو ناساندن و سەپاندنی ڕیزێک گووتاری دیکەدا. خانمی باتلەر پێیوایە کە هەموو پرۆسەیەکی ناواخنکردن، واتە ئەوەی گووتارێک بتوانێت هەموو گووتارەکان بخاتە ژێر سەقفی خۆیەوە، یاخود لە ڕاستیدا بتوانێت بە وردی و بەیەکجار و بۆ هەتاهەتایە ڕەگەزەکانی خۆی دیاریبکات و دەرەوە و ناوەوەی خۆی بە ڕوونی بنوسێتەوە و یەکجار بەرچاوڕوونییەکی هەمیشەیی ببەخشێتە هەڵگرانی بوونی نییە، گووتار ناتوانێت دەرگاکانی دابخات، کۆتاییهێنان بە پرۆسەی ناواخنکردن و دەرکردن و خولقاندن لە فەزای گووتاردا کاری نەکردەیە «مارشارت ٢٣٨ ـــ ٢٣٩»، ئەم ئیدیالە مەحکومە بە نوشوست. لەبەرئەوە هەمیشە پرۆسەیەکی بەردەوامی «ڕێکخستن و ڕیزبەندی و هێنانەگفت» واتە پرۆسەیەکی بەردەوامی «ڕیئارتیکولاسیۆنReartikulation » هەیە کە سیستمی ناو گووتار ڕێکدەخاتەوە و دەرەوە و ناوەوەی دروستدەکاتەوە. ئەمە کێشەیەکی گرنگ و گەورە بۆ تەواوی زانستی سیاسەت دروستدەکات، چونکە گەیشتن بە ئیدیالێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە هەمووان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە کاری نەکردەیە، هەمیشە کردنە دەرەوەی کۆمەڵێک ڕەگەز هەیە، هەمیشە بەلاوەنانی هەندێک گووتار یان هەندێک گروپ هەیە. وەدەرنان و دەرکردنی کۆمەڵێک گووتار، مەرجێکی گرنگی ئیشکردنی پرۆسەی کۆمەڵایەتییە، لێرەوە هەڵە گەورەکە ئەوەیە کە بمانەوێت کۆمەڵگا یەکەیەکی داخراو و چوونییەک بێت، یان بکەوینە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی بیکەینە یەکەیەکی سفت و چوونیەک کە دەرکردن و وەلاونانی تێدا نەبێت، وەلاوەنان و دەرکردن و خۆجیاکردنەوە مەرجی هەموو بڕیارێکە، ئیدی فەردی بێت یاخود کۆمەڵایەتی. بە مانایەکی تر ئازادی لەسەر بەلاوەنانی هەندێک

گووتـار و خۆجیاکردنـەوە کاردەکات. بـەڵام بـۆ ماهییەتـی ئـازادی و بـۆ ماهییەتـی کۆمەڵگاش زۆر گرنگە بزانیـن سـەرچاوەی بڕیارەکانمـان لـە کوێوە دێن، بەڵام ئـەو جێگایـەی ئـازادی و بڕیاری ئـازادی ئێمـەی لێوەهەڵدەقوڵێت، جێگایەکـە پڕیشـە لـە ئەگـەری دیکـە کـە نابینیـن، شـوێنێکە دەکەوێتـە پشـتی ئـەو جەبرانـەی لێـرەدا حاکمـن. خـودی ئـەو جێگایـە، خـودی ئـەو تاریکییـە گرنگییەکـی گـەورەی بـۆ هەمـوو پرۆسیسـی کۆمەڵایەتـی هەیـە. هەمـوو گووتارێـک لەسـەر دەرکـردن و وەلاوەنانـی گووتـاری دی دەخولقێـت «لـە مـەدا لاکلاو و فۆکـۆ زۆر لـە یـەک دوور نیـن، گەرچـی لاکلاو پتـر دێرێدایيـە لـەوەی فۆکۆیـی بێـت». لاکلاو گەلێـک ورد دەستدەخاتە سـەر ئـەو کێشـانە و دەڵێـت : «بەلاوەنـان لـە سـتراکتوری هەمـوو بڕیارێکدایـە... بڕیـار بۆئـەوەی بڕیاربێـت، دەبێـت لـە کایەیەکـەوە بدرێـت کـە تێیـدا لـە ڕووی سـتراکتورییەوە بڕیـاری لـێ نەدرابێـت. گـەر وانەبێـت و ئـەو بڕیـارە پێشـتر بـە حوکمـی سـتراکتور دەستنیشـانکرابێت، ئـەوە چـی دی بڕیـاری مـن نییـە. مەرجـی هەمـوو بڕیارێـک ئەوەیـە بـە جۆرێکـی پێشـوەخت و حیسـابی نەسـەپێنرابێت، بـەڵام لـەو دۆخـەدا کـە بڕیـار لـە خۆیـەوە هەڵبقوڵێـت و لـەدەرەوە دیـاری نەکرابێـت، مانـای ئـەوەی کـە ئەلتەرناتیڤەکانـی دیکـە خراونەتـە لاوە و سـووک و سـانا کراونەتـە دەرەوە. کاتێـک ئێمـە لـە بڕیـاری فەردییـەوە بـەرەو بڕیـاری دەسـتەجەمعی دەڕۆیـن، ئـەو کاری بەلاوەنـان و دەرکردنـە ڕۆشـنتر و ڕوونتـر دەبینرێـت. چونکـە لـە دۆخـی بڕیـاری دەسـتەجەمعیدا ئـەو ئەلتەرناتیڤـەی کراوەتـە دەرێ و وەلاوە خـراوە، دەشـێت بڕیـار و هەڵبـژاردەی گروپێـک بێـت لـە گروپـەکان، لێـرەوە ڕەهەندێـک لـە ڕەهەندەکانـی بەلاوەنـان گرێـدراوی سـەرکوتکردن و چەپاندنـە، کە پێشـوەخت لـە شـێوە بڕیـاری فەردیشـدا بـە چەشـنێکی ژێرەوانکـێ و شـاردراوە ئامادەیـە. مـن دەڵێـم، کـە هیـچ کۆمەڵگایـەک بەهـۆی ئـەو هـۆکارە بنەڕەتییانـەوە بەبـێ وەدەرنـان و دەرکـردن بوونـی نییـە، نـە تەنیـا لـە بەرئـەوەی کۆمەڵگایـەک

بەبێ دەرکردن و وەدەرنان لە رووی پراکتیکییەوە نامومکینە، بەڵکو لە رووی لۆژیکیشەوە نەگونجاوە. چونکە کۆمەڵ لە رێگای ئەو بریارانەوە دروستدەبێت کە لە قەڵەمرەویێکەوە دێنەدەرێ کە بریاری لێنەدراوە. ئێمە دەکرێت تا دەتوانین بەجۆرێکی دیموکراسییانە، لەگەڵ دەرکردن و وەلاوەنانەکاندا بجوڵێینەوە « بۆ نمونە: بەپێی پرەنسیپی کەمایەتی و زۆرایەتی»، بەڵام ئەوە ناتوانێت ئەو راستییە بشارێتەوە کە سیاسەت لە رووبەری هەرە گەورەیدا، ریزێک دانوستانە سەبارەت بەو دەرکردن و وەدەرنانانە» «لە گفتوگۆیەکی نێوان لاکلاو و جودیس باتلەردا لەلای مارشارت. ٢٤٢». ئالێرەدا لاکلاو جارێکی دی ئامـاژە بەو تێزە هیگڵییە بەناوبانگە دەداتەوە کە دەڵێت «هەموو دیاریکردنێک، نەفیکردنیشە». هەرکات شتێکمان هەڵبژارد، شتێک دەردەکەین... بەڵام بەوەدا فۆرمی راستەقینەی گووتار، هەمیشە کاتییە و سنوورەکانی هەمیشە گۆڕدراون، هەموو نەفیکراوێک ساتێکی هاتنەوەی هەیە، بە چەشنێک دەتوانین بڵێین لە کایەی گووتاردا غەریبەکان زۆرجار دەگەرێنەوە. بۆ نمونە لە سالآنی چل و پەنجا و شەستەکاندا گووتاری دینی بەتەواوی لە گووتاری سیاسی کوردی کرابووە دەرێ، بەڵام لە ناکاو ئەم گووتارە گەرایەوە و ئێستا بەشێکی ئۆرگانی تەواوی گووتار و سیستمی سیاسی ئێمەیە، بە هەمان شێوە گەرانەوەی گووتاری چەپیش گەرانەوەیەکی شیاو و چاوەروانکراوە، چونکە لە جەوهەردا هەر رەگەزێک کە نەفیدەکرێت، دەشێت بە جۆرێکی دی و بەشێوەیەکی دی و لە سیاقێکی دیدا بگەرێتەوە. بەڵام لە ئاستی فۆرمی گووتار و فۆرمی کۆمەڵدا «لێرەدا وشەی کۆمەڵ لە بری وشەی کۆمەڵگا بەکاردەهێنم، چونکە لاکلاو زۆر بە گومانەوە سەیری وشەی کۆمەڵگا دەکات» ئەمە چ مانایەکی هەیە؟. لاکلاو و مۆف پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە سنووری گووتار سروشتێکی ناکۆک «ئەنتاگۆنیستی» هەیە. گووتار دەبێت لە رێگای سنوورێکەوە خۆی

جیابکاتــەوە، بــەڵام بوونــی ئــەم ســنوورە هەمیشــە ئەوەمــان بیردەخاتــەوە کــە ئــەم گووتــارە گووتارێکــی ناتــەواوە و هەمــوو شــتەکانی لــە خــۆی نەگرتــووە و کۆمەڵێـک ئەلتەرناتیڤـی دیکـەی شـاردۆتەوە و کۆمەڵێـک ئەگـەری خنکانـدوە، واتــە چەنــدە دیــواری گووتــار ئەســتوور بێــت، ئەوەنــدە ئــەو ئەلتەرناتیڤانــەش زەقدەبنــەوە کــە دیوارەکــە ناهێڵێــت بیانبینیــن، لێــرەوە ســنووری گووتــار، ئامــاژەیــە بــۆ جەوهــەری ناکۆکــی گووتــار. ســنوور بــە دیوێکــدا گووتــار دروســتدەکات و دەیخولقێنێــت، بــە دیوێکــی دیــدا سروشــتی زۆرکار و چەپێنــەر و ڕوخێنــەری گووتــار ئاشــکرادەکات، بەدیوێکــدا گووتــار جیادەکاتــەوە، بــە دیوێکــی دیــدا گووتــار دەخاتــە ژێــر فشــارێکی بەردەوامــی دەرەوەی خــۆی، لــە کەنــارەوە پاڵەپەســتۆیەکی قووڵــی بــۆ دروســتدەکات کــە وادەکات بــەردەوام ئــەو ســنوورانە قابیلــی هــەرەس و گــۆڕان و دەســتکاریکردن بــن. بــەڕای لاکلاو ئــەم ســنوورانە نابینرێــن، شــتێک نییــە دیاریبکرێــن، بــەڵام هەســتی پێدەکرێــت و گــۆڕان و جوڵەیــان دەبینرێــت. «بــۆ زیاتــر زانیــاری بڕوانــە. لاکلاو، ٢٠٠٢. ل.٦٦- ٦٩». هەمــوو گووتارێــک دەیەوێــت خــۆی نمایشــبکات، هەمــوو گووتارێــک لــە کایەیەکــی گووتــاری گەورەتــردا دەژی، دەرەوەی گووتــار دونیایەکــی بێلایــەن و بەتــاڵ نییــە، بەڵکــو ڕســتێک گووتــاری دیکەیــە، لاکلاو دەرەوەی گووتــار بــە کایــەی گووتــار Das diskursive Feld ناودەبات. کایــەی گووتــار زۆر لــە مەرجەکانــی گووتــار و پرۆســە ناوەکییەکانــی گووتــار دیاریــدەکات. لێــرەوە گووتــار و ســنووری هێڵێکــی بینراویــان نییــە، بەپێچەوانــەوە گووتــار لای ئــەو وەک تۆپێــک وەهایــە کــە ســنوورەکانی پــڕن لــە کــون و دەلاقــەی کــراوە، کــە وادەکــەن هەمــوو فۆرمێکــی گووتــار کاتــی و تێپەڕبێت.

ئــەوەی لــەم تێڕوانینــەدا بــۆ گووتــار گرنگــە، ئەوەیــە کــە بــە ڕۆشــنی بەرەو ئــەو تێزەیەمــان دەبــات کــە لاکلاو زۆر پێــی لەســەر دادەگرێــت، و پێیوایــە کۆمەڵــگا بوونــی نییــە، کۆمەڵــگا جــۆرە ناونــان و ڕێکخســتن و ڕیزبەندییەکــی

سیاسییە کە بەردەوام دروستدەکرێتەوە، هەمیشە ڕووبەرێک هەیە کە بڕیاری لێ نەدراوە و هەمیشە ڕووبەرێک هەیە کە ڕێگا بۆ ڕێکخستنەوە و دروستکردنەوەی فۆرمی کۆمەڵایەتی ئاساندەکات، واتە هەمیشە سێوێکی سێهەم هەیە کە نازانین چییە، کە ماهییەتی نابینین، بەڵام ئاسۆیەکی دی و ئەزموونێکی نوێمان پێشکەشدەکات. بەپێی ئەم تێڕوانینە کۆمەڵگا واقیعێکی بابەتی نییە کە ئێمە ئەوەمان لەسەر بێت تێیبگەین، کۆمەڵگا پێکهات و شێوەیەکی دیاریکراوی نییە تا تەواوی بەرنامەمان ئەوە بێت گەر لەو شێوەیە دەرچوو خۆمان بڕەتێنین دروستیبکەینەوە، یاخود هەوڵبدەین دووبارە بیگێڕینەوە سەر ئەو هێڵ و ڕوکار و لایەنە. سیاسەت تەعبیرکردنە لە سروشتی ئەنتاگۆنیست «ناکۆک»ـی کۆمەڵگا، بەرجەستەبوون و دەرکەوتن و خۆبەیانکردنی ئەو ساتانەیە کە تێیدا بڕیاردان تێیدا زەحمەتە. لە هەر چرکەیەکدا، لە هەر تێزەیەکدا کە بڕیاردان ڕوون و ئاسان بوو، سیاسەت ئامادەگییەکی ئەوتۆی نییە، سیاسەت ئەو دۆخەیە کە تێیدا دەمانەوێت لە «بێبڕیارییەوە» ڕووە و «بڕیار» بگوازینەوە. لە دەرەوەی گووتارەوە، یان لە گووتارە دەرکراوەکانەوە بەرەو ناو گووتار، واتە لە نادیارەوە ڕووەو خۆنمایشکردن و هاتنەگفت و خۆدەرخستن بگوازینەوە. سیاسەت لە دیدی لاکلاوەوە منداڵی ئەو ساتە نییە کە تێیدا دوودڵ نین و دڵنیاین، بەڵکو منداڵی ئەو ساتانەیە کە تێیدا ڕێکەوتنە کۆمەڵایەتییەکان بەرەو هەرەس دەڕۆن. سیاسەت بەڕای لاکلاو کاتێک دێتە پێشێ کە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی تووشی نارێکی ببێت «مارشارت. ١٨٢».

بە کورتی ساتی کوژاندنەوەی چراکە و خواردنی سێوەکە ساتێکی بە ئیمتیاز سیاسییە، چونکە هەڵقوڵاوی ساتێکی قەیرانە، هەڵقوڵاوی ساتێکی نارێکی و نەبوونی بەرچاو ڕوونییە، هەوڵی دەرچوونە لەقەیران، بەڵام بە پەلاماردانی ئەگەرێکی نادیار... سیاسەتیش لە جەوهەریدا ئەو

کایەیە کە پڕێتی لە ئەگەری نادیار.

گەر لێرەوە، لەم تێزەیەوە «کە گرنگییەکی گەورە بە سنووری گووتار و پەیوەندی گووتار بە ساتەکانی نەبوونی بڕیارەوە دەدات» بجولێین زیاتر تێدەگەین بۆ سێوی سێهەم سێوێکی گرنگە، واتە لە سێوی یەکەم و دووهەم گرنگترە. نە تەنیا لە بەرئەوەی بەدروستی نازانین چییە، نا لەبەرئەوەی نوێنەری ئەگەرێکی نادیارە، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوەمان بیردەخاتەوە کە شتێک هەیە لەدەرەوەی ئەوەی کە دەیبینین، لەبەرئەوەی ئەوەمان بیردەخاتەوە کە دەستنیشانکردنی بنەبڕ و ناونانی بنەبڕ و ماهییەتسازی موتڵەق، واتە سنوورکێشانی ڕەها بۆ گووتار بوونی نییە، ئەوەمان بیردەخاتەوە کە سێوی یەکەم و دووهەم تەعبیری کۆتایی نین لە ماهییەتی سێو، پێماندەڵێت کە دەشێت سێو شتێکی دیکە بێت، تامێکی دیکەی هەبێت. یان ڕاستتر وایە بڵێم ئەوەمان بیردەخاتەوە کە سێوی ڕاستەقینە هەمیشە سێوێکە کە نازانین چییە، سێوی ڕاستەقینە شتێکە هەمیشە لە نێوان ئەگەر و نەگەردایە، دەکەوێتە سەر سنووری دەبێت و نابێتەوە. گەر لە مانا مەجازییەکەی سێویش دەرچین، دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای ڕاستەقینە ئەو کۆمەڵگایەیە کە شانازی بە شوناسییەوە ناکات، بەڵکو شانازی بە ئەگەرەکانی ناوییەوە دەکات.

بۆئەوەی ئەمە زیاتر ڕوونبکەمەوە، دەبێت بەکۆمەڵێک پرۆسەی گرنگی تێڕاماندا لە خودی سێوەکە بڕۆم:

١. گرنگترین شت نابێت لە یادیبکەین، ئەوەیە کە سێوی سێهەم تەنیا سێوێکی ئیفتیرازییە، واتە هەریەک لە سێوی یەکەم و سێوی دووهەمیش دەکرا ببنە سێوی سێهەم. واتە سێوی سێهەم لای کەسی سێوخۆری ناو ژوورەکە، دەشێت لای من ببێتە سێوی دووهەم و لای یەکێکی دی لە ژوورێکی دیکەدا ببێتە سێوی یەکەم، چونکە هەرکەسە و بەپێی پێزبەندی خۆی، سێوەکان ڕیزدەکات. ئەمە مانای ئەوەی کە

گووتـار هەمیشـە ناتەندازەیەکـی زۆر بەپێـی شـوێنگە و جێـگای سـوبێکت، واتـە بەپێـی ڕوانگـەی فـەرد دەگۆڕێـت. ئـەو سـێوەی لای مـن وەک سـێوی سـێهەم، وەک هەڵگـری ئەگـەرە پۆزەتیڤەکـە دیـارە، لای یەکێکـی دی، لـە ژوورێکـی دیـدا، لـە کاتێکـی دیـدا دەشـێت ببێتـە سـێوە کرمێکـە. لێـرەوە بۆنـەوەی لـە سـێوی سـێهەم تێبگەیـن دەبێـت لـەو دۆخـە جەوهەرییـە تێبگەیـن کـە هـەر کەسـەو سـێوی سـێهەمی خـۆی هەیـە « واتـە: هـەر کەسـەو ڕیزبەنـدی تایبەتـی گووتـاری هەیـە». سـێوی سـێهەم ماهییەتـی نییـە، سـێوێکی خالییـە. بۆیـە هـەر چرکەسـاتە و سـێوی سـێهەمی خـۆی هەیـە... سـێوی سـێهەم خاڵێکـی هاوبەشـە، هەمـوو سـاتە وەختـە مێژووییـی و کۆمەڵایەتییـە گرنگـەکان پێویسـتیان بـە سـێوی سـێهەمی خۆیـان هەیـە... پێویسـتیان بـە ئەلتەرناتیفێکـی سـێهەم هەیـە، پێویسـتییان بـەوە هەیـە کـە دڵنیابـن ڕووبەرێکـی نادیـاری ژیـان و بـوون هەیـە کـە بـە ڕۆشـنی دیارنییـە هێشـتا چـی تێـدا سـەوزدەبێت، سـێوی سـێهەم بـەوەدا دەبێتە سـێوی سـێهەم کـە جەوهـەری دیارنییـە، دەرەوەی گووتـارە، ئـەو شـوێنەیە کـە پێشـتر لـە نـاو گووتـاردا جێـگای نابێتـەوە، ئـەو تاریکییەیـە کـە گووتـار نایبینێـت، ئـەو شـوێنەیە کـە پێویسـتمان پێیەتـی بۆنـەوەی تێبگەیـن کە لەدەرەوەی سیسـتم جێگایەکـی تـر و ئەگەرێکـی تـر هەیـە کـە لە ناو سیسـتمدا بەر قـەرار نابێت... واتـە وەک لاکلاو دەڵێـت بەڵگەیەکـی هەمیشـەییە بـۆ دانەخرانـی گووتـار. بـە مانایەکـی تـر، سـێوی سـێهەم تاکـە ئومێـدە بـۆ دووبارەنەکردنـەوەی سـێوی یەکـەم و دووهـەم، تاکـە دەرگایەکـە بـۆ دەرەوەی دونیـای یەکـەم و دووهـەم. سـێوی سـێهەم ئاماژەیـە بـۆ دانەخرانـی هەمیشـەیی گووتـار، بـۆ ئـەو ڕاسـتییە سـەرەکییەی لاکلاو دەستنیشـانیدەکات کـە گووتـار هەمیشـە ناتـەواوە، هەمیشـە لـە ڕیزبەندییەکەیدا ئەگـەری ڕێکخسـتنێکی دیکـە هەیـە.

٢. بـە مانایەکـی دیکـە سـێوی سـێهەم دوا سـێو نییـە، سـێوی کۆتایـی

نییە... سێوی سێهەم ئاماژە نییە بۆ دوا ڕێگا، بۆ دوا هەڵبژاردن، بۆ دوا فۆرمی کۆمەڵگا یاخود بۆ دوا فۆرمی گووتار، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەگەرێکی سێهەمی هەمیشەیی، بۆ ئەگەرێکی کراوەی ئەبەدی... بۆ ڕێگایەکی کراوە کە کۆتایی نایەت. بۆ کۆی ئەو ناکۆتایەی کە دەکەوێتە سنووری بڕوا و بینینەکانمانەوە. ڕاستە بۆئەوەی بتوانین سێوی سێهەم تاقیبکەینەوە پێویستیمان بە برێک تاریکی هەیە، بەڵام ئەم تاریکییە ئاماژە نییە بۆ زوڵمەت بە مانا نێگەتیڤەکەی، بەڵکو تاریکییەکی بلۆخییە، «هێشتا نەبوونە» ئەوەک عەدەمی ڕەها. سێوی سێهەم ئاماژە نییە بۆ کۆتایی هەڵبژاردنەکانمان، بەڵکو بۆ ئەو کرانەوە گەورە و بێسنوور و نادیارەی کە لە پێشدەمماندایە. سێوی سێهەم ئەو ڕووبەرەیە کە بە زاراوەکانی لاکلاو هێشتا بڕیاری لێ نەدراوە، ئەو جێگایەیە کە دەبێت شەڕ لەسەر چۆنایەتی و ماناکەی بکەین. شوێنێکە بۆ بڕیارێکی دیکە.

٣. سێوی سێهەم سێوێکی بێشوناسە، گرنگییەکەشی لەوەدایە کە سێوێکی بێشوناسە... واتە جۆرە بەتاڵییەک دروستدەکات کە بەتاڵییەکی پێویستە بۆئەوەی دەست پێبکەینەوە. ئەم بۆشاییەی سێوی سێهەم بەرجەستەی دەکات، جیاوازە لەو بۆشاییەی کە پاپۆچی ئەگەری یەکەم و دووهەم دروستیدەکەن... ئەو بۆشایی و بەتاڵییەی کرمێبوونی ئەگەری یەکەم و دووهەم دروستیدەکەن، گرێدراوی گەیشتنی هەڵبژاردنێک و بڕیارێک و گووتارێکە بە دوائاستی خۆی، واتە بەتاڵبوونەوەی هێزی کردارێکی مێژووییە، بەتاڵبوونەوەی سیحری سێوێکە لەسەر «سێوخۆرەکە - واتە بەتاڵبوونەوەی سیحری گووتارێکە لەسەر مەسرەفکەر و بەکارهێنی گووتار». واتە بۆشایی یەکەم و دووەم، بۆشایی هەرەسی ئەگەرە مێژووییەکانن، بۆشاییەکن دەکەونە دوامانەوە، بەڵام بۆشایی سێهەم، بۆشاییەکی پێویستە بۆ دەستپێکردن بە دروستکردنی داهاتوو. سێوی

سێیەم دەستکردنەوەیە بە گەمەکە لەسەرەتاوە، گێڕانەوەی ئەگەری قەبووڵکردن و نەکردنی سێوەکەیە. چونکە کۆمەڵگا هەمیشە پێویستی بەسەرەتا هەیە. کۆمەڵگا بەوە نـاژی کە تەنیا درێژە بە خۆی بدات، بەوە دەژی کە بەردەوام بتوانێت لە ئەگەری نوێوە دەست پێبکاتەوە، بەردەوام توانای ئەوەی هەبێت لەسەرەتاوە دەست پێبکاتەوە. بەڵام بێشوناسی ئەم سەرەتا تازەیە، بەجۆرێکی بەرچاوە چەمکی سوبێکتی لاکانیمان یاددەخاتەوە. ئەو جۆرە سوبێکتەی لاکلاو و موف لە تیورە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەیاندا زۆر پشتی پێدەبەستن.

٤. سوبێکت لە تێڕوانینی لاکانیدا، هەمیشە نوقسانە و ئاماژەیە بۆ بۆشایی، واتە جەوهەرێکی نییە، شوێنێکی خاڵییە کە ئامـاژە بۆ ئامادەگی فەرد دەکات بۆ هەڵگرتنی شوناسێک، بۆ تەماهیکردن لەگەڵ کەسێک یان بابەتێکدا کە دەبێتە هەوێنی کاراکتەر و داڕێژەری شوناس. لای لاکان نیگاکردنی سوبێکت وەک ڕووبەرێکی بەتاڵ، وەک نوقسانییەک کە بەردەوام هەوڵدەدرێت پڕبکرێتەوە، بنەمای یەکەمی فەلسەفەکەیەتی، لای لاکان سوبێکت هەوڵە بۆ پڕکردنەوەی سوبێکت. لاکلاو ئەم تێزەیە بە بەربڵاوی لە لاکان وەردەگرێت و دەڵێت «گەر لەگەڵ شتێکدا تەماهیبکەم، لەبەرئەوەیە من لەسەرەتاوە شوناسێکی تەواوم نەبووە» «لاکلاو. ٢٠٠٢. ١٣٥». بەڵام وەک ژیژیک دەڵێت لای لاکان ئەم نوقسانییە، تەنیا نوقسانییەکی ناو سوبێکت نییە، بەڵکو جیهانی ئۆبێکتیش هەڵگری هەمان سیفەتە. «ئەوی گەورە ــ Der große Andere » کە لای لاکان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت و ئامازەیە بۆ تەواوی فەزای سەمبولی، بەجۆرێک لە جۆرەکان ئامـاژە نییە بۆ هێزێکی دەستنیشانکراو یان فۆرمێکی سەمبولی داخراو، بەڵکو بە پێچەوانەوە جیهانی ئۆبێکتیڤیش لە ناو سیستمی ڕەمزیدا هەمان نوقسانی و بۆشاییە کە دەبێت پڕبکرێتەوە.

لێرەوە گرنگە بەردەوام چ لە ئاستی سیاسی و چ لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا خەیاڵمان لای ئەوە بێت کە نە شوناس و نە هەڵبژاردنەکانی شوناس، داخراو نین. سێوی سێهەم هەڵگری هەمان خاڵێتی سوبێکتە، واتە ئەو جێگایەی ناو مێژووە کە هەمیشە بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، ئەو گووتارەیە کە هەمیشە چاوەڕوانی پڕکردنەوە دەکات، ئاماژەیە بۆ نوقسانییەکی ئەبەدی لە پرۆسەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، واتە دوای هەموو ئەزموون و قەیران و تێکچوونێک دەبێت جێگایەکی نادیار هەبێت، شتێک هەبێت بشێت دووبارە کاری تێدابکەینەوە، سێوی سێهەم مەجازی ئەو ڕێگایەیە کە هەمیشە بەکراوەیی دەمێنێتەوە. وەک چۆن سوبێکتی لاکانی ئامارەیە بۆ نوقسانییەکی ئەبەدی لە کاراکتەری تاکەکەسدا، سێوی سێهەم مەجازێکە بۆ ئەو نوقسانییەی ژێرێک لە ئاستی ئۆبێکتدا ئامارەی بۆدەکات کە تەریبی سوبێکتی خاڵی لاکانییە، نوقسانییەک کە دەمانجوڵێنێت سەر لە نوێ کار بۆ پڕکردنەوەی بکەین... لێرەوە دەتوانم بڵێم کە سێوی سێهەم، سێوێکی ئەبەدییە.

٥. خاڵێک کە ئێجگار جەوهەرییە و نابێت لە بیرمان بچێت ئەوەیە کە کۆی نوکتەکە لەسەر ئامادەگی سێوێکی چوارەم بونیادنراوە، سێوێکی نادیار و نەبینراو کە لە پشتەوەڕا کۆی نوکتەکە کۆنترۆڵدەکات. سێوێکی ئیدیال کە پێوەری هەموو سێوێکە، سێوێکی ئەفلاتونی کە جەوهەری سێو پیشاندەداتەوە، سێوێک کە کرمی نییە، کە بەبێ ترس دەخورێت، کە مرۆڤ دەتوانێت لە ڕوناکیدا بیخوات. ئەم سێوە ئیدیالە، کە نوێنەری سیستمی سەمبولیانەی لاکانییە، ئەو ئامانجەیە کە لە پشت هەر سێ سێوەکەوەیە، ئەو سێوە گەورەیەیە کە هەر سێ سێوەکە دەیانەوێت چۆنایەتی و ماهییەتیان بچێتەوە سەری. سێوی یەکەم و دووەم بەجۆرێک لە جۆرەکان دوورکەوتنەوەن لەو ئیدیالە، واتە ڕووی نەگەتیف

و شکستخواردوی ئەزموونی مێژوویی و کۆمەڵایەتی نیشاندەدەنەوە، بەڵام سێوی سێهەم جارێکی دی دەرگای گەیشتنەوە بە ئیدیال، دەرگای یۆتۆپیا دەخاتەوە سەر پشت، ئاماژەیەکی زەق و گرنگە بۆ «ڕیالی لاکانی ـ بڕوانە وتاری سێهەمی ئەم کتێبە». واتە ئەوەی سێوی سێهەم دروستدەکات، نەکردەیی و نوقسانی سێوی یەکەم و دووهەمە. بەبێ سێوی سێهەم ئەستەمە دەرگای گەیشتن بە سێوی چوارەم جارێکی دی بکرێتەوە، بەڵام لە جەوهەردا سێوی سێهەم ئەوەشە کە هیچ کات ناهێڵێت بگەینە سێوی چوارەم، چونکە شوێنی نەگەیشتنی خەونی باڵا و ئیدیالەکانە بە کۆتایی، بە ناونانێکی هەمیشەیی، سێوی چوارەم سێوێکی خەیاڵییە، سێوێکی فەنتازییە کە نایگەینێ، بەڵام سێوی سێهەم ئاماژەیە بۆ ئەو دەرگا و ڕێگا هەمیشەیی و ئەنتۆلۆژییەی پێویستمانە بۆ ئەوەی بەردەوامبین. دیارە هەڵەیەکی گەورەیە سێوی سێهەم تەنیا و تەنیا وەک سێوێکی یۆتۆپی سەیربکەین، سێوی سێهەم تەنیا لەتێکی یۆتۆپییە، لەتەکەی دووەمی بەپێچەوانەوە هەڵگری ئەگەری ژەهراویبوونە، «بەڵام لە ڕاستیدا چ سێوێکی یۆتۆپی هەیە، لەتێکی ژەهراوی نەبێت؟؟». سێوی سێهەم ئاماژەیە بۆ ئەو خەرەندە گەورە و چاڵە ئەبەدی و هەمیشەییەی لە نێوان سێوی یەکەم و دووەم لە لایەک و سێوی چوارەم لەلایەکی دیکەدا هەیە.

٦. لێرەوە سێوی سێهەم سنتێزێکی دیالەکتیکی نییە. واتە سێوی یەکەم تێز نییە و سێوی دووهەم ئەنتی تێز و سێوی سێهەم سنتێز... سێوی یەکەم و دووهەم لەبەرئەوە گرنگیان بە ئەندازەی سێوی سێهەم نییە، چونکە هەڵگری هیچ ئەگەرێک نین. واتە ناتوانین چیتر پرسیاری نوێیان لێبکەین... کرمێبوونیان لەوەدایە کە ئەو جێگا خاڵییەیان تێدا نییە کە ئێمە بتوانین پڕیبکەینەوە. سێوی یەکەم و دووهەم هەر

دووکیـان دوو شوناسـی ڕوونیـان هەیـە، هەڵگـری ئـەو بۆشـاییە نیـن کـە پێویسـتە دیاردەیـەک هەڵگـری بێـت بـۆ ئـەوەی لـە مێـژوودا بێتەسـەرەوە، بەڵکـو بەجۆرێـک پـڕ و قورسـن دەکەونـە ژێـر ئـاو و دەبـن بـە ژێـرەوە. کـە دەڵێـم سـێوی سـێهەم، سـنتێزێکی دیالەکتیکـی نییـە، مەبەسـتمە بڵێـم کـە سـێوی سـێهەم ئامـاژە بـۆ داخسـتنی ناکۆکییەکـە نـاکات... بەڵکـو ئامـاژە بـۆ ناکۆکییەکـی ئەبـەدی دەکات کـە چارەسـەر ناکرێـت، کـە دووبـارە دەگەڕێتـەوە. سـێوی سـێهەم جەوهەرێکـی ئەنتاگۆنیسـتی هەیـە، لـە خۆیـدا هەمـوو ئەگەرەکانـی هەڵگرتـووە. واتـە دەمانگێڕێتـەوە بـۆ دونیـای دەرەوەی گووتـار... بـۆ ناکۆتـا... بـۆ پرۆسـەیەکی هەمیشـەیی. لەبەرئـەوە سـێوی سـێهەم هـەرکات ونبـوو بۆئەوەیـە بگەڕێتـەوە.

٧. لـە خـودی نوکتەکـەدا دوو وشـەی هـەرە گرنـگ، وشـەی کرمێبوونـە. کـە ئامـاژە بـۆ وەدەرنـان و وەلاوەخسـتن و دەرکردنـی گووتارێـک یـان ڕیـزە گووتارێـک دەکات، واتـە ئامـاژە بـۆ تۆخکردنـەوەی ناکۆکـی لـە نێـوان سێوەکان و سـێوی ئیدیالـدا دەکات... لەگـەڵ وشـەی «تاریکـی» کـە ئامـاژە بـۆ گەڕانـەوەی ئەگـەری دۆزینـەوەی سـێوی ئیدیـال دەکات. گەڕانـەوە بـۆ جێگایەکـی سـەرەتا کـە بتوانیـن هەموومـان لێـوەی دەسـت پێبکەینـەوە. لـە ئەگـەری سـێهەمدا ڕووبەرێکـی خاڵـی هەیـە، گرنگـی ئـەم ڕووبـەرە مانایەکـی گەردونـی و گشـتی بـەم ئەگـەرە دەبەخشـێت... لێـرەوە زۆر گرنگـە لـە پەیوەندی نێوان سـێوی سـێهەم و دەلالەتی خاڵـی لای لاکان و لاکلاو تێبگەین، چونکە گرنگـی سـێوی سـێهەم لەوەدایـە کـە «دەلالەتێکـی خاڵییـە». لێرەدا دەوەسـتم و دووبـارە هەوڵـدەدەم مانـای دەلالەتـی خاڵـی لای لاکان و کەمێـک لای لاکلاو ڕوونبکەمـەوە... تـا ڕوونتـر لـە گرنگـی ئەگـەری سـێهەم تێبگەیـن.

# ئامازەی خاڵی چییە؟

ژیژیـک لـە جێگایەکـی کتێبـە نوێکەیـدا «Auf verlorenem Posten» گەلێـک قەشـەنگ وەسـفی ئامـازەی خاڵـی «Der leere Signifikant» دەکات. نمونەکـەی ژیژیـک لەسـەر سـەمفۆنیای نۆهەمـی بیتهۆڤنـە. ئـەم سـەمفۆنیایە بـە چەندیـن بەکارهێنانی جیـاواز بەکاردەهێنرێت، لـە چەپـەوە بـۆ ڕاسـت، لـە دیموکـراس و ئازادیخوازەکانـەوە تـا دیکتاتۆرەکان هەمـوو وەک ڕەمزێـک بـۆ خۆیـان بەکاریانهێنـاوە... ئـەم سـەمفونیایە لـە بۆنـەی جیـاواز و لـە سـیاقی جیـاوازدا لێدەدرێتـەوە، لەمسـەری زەوییـەوە بـۆ ئەوسـەری و لـە ژینگـەی کۆمەڵایەتـی جیـا و لـە بۆنـەی جیاجیـادا بەکاردەهێنرێـت. «ژیژیـک ٢٠٠٩. ل٣٧». واتـە ئـەم سـەمفونیایە ئامازەیەکە هـەر کەسـەو ئـەو مانایـەی پێدەبەخشـێت کـە دەیەوێـت. بـەڵام ئەمـە مانـای چـی؟ مانـای ئـەوەی کـە سـەمفۆنیای نۆهـەم خـۆی هەڵگری بەتاڵییەکـە، هەڵگری بۆشـاییەکی دەلالیانەیە کە دەشـێت هەر کەسـە و بە ئارەزووی خۆی پڕیبکاتـەوە. ئامـازەی خاڵـی جـۆرە ناوەندێکی بەتاڵە کە هەمـوان دەیانەوێت مانایەکـی بدەنـێ... یەکێـک لـە نمونـە بـاوەکان بـۆ ئامـازەی خاڵـی چەمکـی «نەتـەوە» یـە. نەتـەوە دەلالەتێکـە کـە هەمـووان بەکاریدەهێنـن، بـەڵام هـەر کەسـەو بەپێـی ویسـت و نیـگا و جیهانبینیـی خـۆی. بۆ نمونـە دانیـال شـولتز چەمکـی نەتـەوەی فەرەنسـی وەک ئامازەیەکـی خاڵـی دەبینێـت کـە بـە کەناڵـی چەندیـن ئایدیـای جیـاوازدا لـە ڕاسـتەوە تـا دەگاتـە چـەپ تێپەڕیـوە

و هەر کەسە و بە شێوازی خۆی پڕیکردۆتەوە. «بڕوانە وتارەکەی دانیال شوتز لە کتێبەکەی مارتین نۆنهۆڤدا . ل. ٢٢٣». بە کورتی ئامازەی خاڵی دەلالەتێکە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاستێکی باڵاتر لە دەلالەتەکانی تر، دەبێتە دەلالەتێک کە هەر کەسە و دەیەوێت دەست بەسەر ماناکەیدا بگرێت، دەبێتە خاڵی هاوبەش لە نێوان هەموو گووتارەکاندا، لێرەوە لاکلاو پەیوەندییەکی توند لە نێوان «ئامازەی خاڵی» و «یونیفرسال ـ بەهای گەردونی» دا دەدۆزێتەوە. بەو مانایەی کە چەمکی یونیفرسالیش ئامازەیە بۆ ڕەگەزێکی هاوبەش و بەهایەکی گشتی کە تایبەت بە جێگایەک نییە، بەڵام لە هەموو جێگا تایبەتییەکانیشدا مانایەکی هەیە، یونیفرسال ئەو شتەیە کە لە هەر جێگایە و لە ناو هەر سیاقێکدا و بەپێی تایبەتمەندی لۆکالەکان سروشتی دەگۆڕێت، بۆ نمونە گووتاری مافی مرۆڤ هەم گووتارێکی یۆنیفرسال و هەم دەلالەتێکی خاڵیشە، چونکە زیاد لە فۆرمێک و زیاد لە هێزێک بەکاریدەهێنن و لە ناو هەرجۆرە ڕێکخستنێکدا وەزیفەیەکی تایبەتی هەیە، سەدام حوسەین ئەم گووتارەی دژ بە ئەمریکا و ئەمریکا دژ بە سەدام حەسەین و تیرۆریستەکان لە گوانتانامۆ دژ بە سیستمی یاسایی خۆرئاوا و خۆرئاوا دژ بە تالیبان بەکاریاندەهێنا. ئیسلام ئامازەیەکی خاڵی دیکەیە، کە هەرکەسە و بە جۆرێک ناویدەنێت، ئیسلام لای هەندێک لەگەڵ جیهانڕدا هاوواتایە و لای هەندێکی دیکە لەگەڵ ئاشتیدا، لای هەندێک هاوواتای ستەمی سیاسی و ئەخلاقییە و لای هەندێک هاوواتای عەدالەتە، لای هەندێک چەوساندنەوەی ژنە و لای هەندێک پاراستن و حورمەتی ژنە. بە کورتی ئامازەی خاڵی، ئەو ناوەندە پێویست و گرنگەیە کە لەیەک کاتدا هەموو گووتارەکانی تر دەتوانن پردی لەگەڵدا دروستبکەن و لە ڕێگای ئەوەوە شوناسی خۆیان دروستبکەن، واتە جۆرە ئامازەیەکە کە خۆی مانا و ناوەڕۆکی نییە، بەڵکو گووتارەکانی تر و دەلالەتەکانی تر مانا

و ناوەڕۆکی پێدەبەخشن، وە بە جۆرێک لە جۆرەکانیش مانای خۆیان بەپێی پەیوەندیان بەو ئاماژەیەوە دەستنیشاندەکەن. لە ناوەڕاستی پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا، هەمیشە ناوەندێکی خاڵی دەمێنێتەوە، کە بە هیچ گووتارێک پڕناکرێتەوە، ناوەندێک کە پرکردنەوە و داگیرکردنی تەواوەتی کاری نەکردەیە، بەڵام هەر گووتارە و هەوڵدەدات باڵادەستی خۆی بەسەر ئەو ناوەندەدا بسەپێنێت، لێرەوە ئامارەی خاڵی پەیوەندییەکی گەورەی بە پرۆسەی «هیمنة ـ یاخود سالارگەراییەوە» هەیە «هەندێک لە برا نوسەرەکانی دی، هەر بەداتاشین لە زاراوەی هیگیمۆنییەوە بە هەژمونگەرایی وەریدەگێڕنە سەر کوردی». دەلالەتی خاڵی، دەبێتە ئەو خاڵە هاوبەشەی کە گەلێک گووتاری جیا پێکەوە گرێدەدات. لێرەوە لای لاکلاو دەلالەتی خاڵی دەبێت بە پنتی پێکەوەگرێدانی هەموو گووتارەکان Knotenpunkt. لە ناوەڕاستی هەموو کایەیەکی گووتاردا چەندین پنتەگرێی وەها هەیە. بۆ نمونە لە خۆرهەڵاتی ئێستای ئێمەدا وشەگەلی وەک «خودا، موقەدەس، دیموکراسییەت، مافی مرۆڤ، ئیسلام، نەتەوە، ڕەسەنایەتی، گۆڕان، نوێگەریی» نمونەی زنجیرەیەک لەو ئامارە

خاڵیانەن کە گووتارە جیاوازەکان پەیوەندی جیاواز و بزۆک و ناجێگیریان لەگەڵدا دروستدەکەن، دەلالەتی خاڵی دەلالەتێکە هەمیشە بۆشاییەکی تێدایە بۆئەوەی ئەوانی دی بێن و پڕیبکەنەوە، سنوورێکی هەیە هەموو ئەوانی تر لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، وادەکات لە نێوان گووتارە جیاوازەکاندا شتێکی هاوبەش و چەقێکی نادیار هەبێت کە هەموو هەوڵی داگیرکردنی بدەن، بێئەوەی داگیرکردنی تەواوەتی شیاو یاخود کاری کردەبێت. لێرەوە ئەوەی وادەکات کۆمەڵگا پێکهاتێکی مومکین بێت، ئامارەی خاڵییە، چونکە هەموو دەلالەتەکانی دی لە ڕێگای ئامارەوە بۆ ئەو مانای خۆیان وەردەگرن. «کریستیان فلاتز. ل. ٢٠٣». ئامارەی خاڵی ئەو ئامارە «گشتی» یەیە کە بەیەک هێز پڕناکرێتەوە، بۆیە

گشتیشـە چونکـە هیـچ کـەس بـە تەنیـا ناتوانێـت خاوەنـی بێـت. ژیژیـک گەلێـک ڕوون تەعبیـر لـەوە دەکات و لـە کتێبـی «مەکـری سـوبێکت» دا دەنوسـێت: «ئـەوەی گشـتییە، پـڕ نییـە، بەڵکـو هـەر پێشـوەخت بەتـاڵ و خاڵییـە، ناوەڕۆکـە جیـاوازەکان هـەردەم بۆئـەوە هەوڵـدەدەن ئـەو بەتاڵـی و درزە پڕبکەنـەوە، ئەوەشـی کـە بـە سـەرکەوتوویی وەزیفـە سـالارگەراکە وەردەگرێـت، تەنیـا بـۆ ماوەیەکـی دیاریکـراو و تێپـەڕ ئـەو جێـگا بەتاڵـە پڕدەکاتـەوە» «ژیژیـک.٢٠٠١. ل ٢٥٠. بـۆ زانیـاری زیاتریـش دەربـارەی ئامـاژەی خاڵـی لای ژیژیـک سـەیری هەمـان سـەرچاوە ل. ١٥٤ بکـە ». واتـە ئـەوەی لـە سـاتێکدا هەیمەنـە و باڵادەسـتی هەیـە، دەبێـت بزانێـت کـە ئـەو تەنیـا بەجۆرێکـی کاتـی دەتوانێـت مانـای ئامـاژە خاڵییەکـە داگیربـکات و گووتارەکانـی دی ڕێکبخاتـەوە، هیـچ داگیرکردنێـک بـۆ ئامـاژەی خاڵـی داگیرکردنێکـی هەمیشـەیی نییـە، هیـچ هێزێـک بەتەنیـا خاوەنـی نەتـەوە یـان دیموکراسـییەت یاخـود خـودا نییـە، هەمیشـە جێگایەکـی خاڵـی لـە نـاو ئـەم زاراوانـەدا هەیـە کـە بەتەنیـا بـە هیـچ هێزێـک پرنابێتـەوە. لـە مانـە ڕوونتـر لاکلاو خـۆی دەنوسـێت هـۆی بوونـی دەلالەتـە خاڵییـەکان لـە ناوەڕاسـتی کایـەی دەلالیـدا، دەگەڕێتـەوە بۆئـەوەی هەمـوو سیسـتمێکی دەلالـی، لـە چواردەوری جێگایەکـی خاڵـی دەخولقێـت، ئـەو «جێـگا خاڵییـە» نیشـانەی ئـەو مەحاڵەیـە کـە سیسـتمەکە پێویسـتی پێیەتـی تـا یەکانگیـری ناوخـۆی بپارێزێـت. بـەڵام وەک لاکلاو دەڵێـت جیـاوازی ئـەم مەحاڵـە لەگـەڵ مەحاڵـە مەنتیقییەکانـدا ئەوەیـە کـە ئەمەیـان مەحاڵێکـی پۆزێتیڤـە، مەحاڵێکـی ڕاسـتەقینەیە «لاکلاو.٢٠٠٢. ل٧٠».

بـەڵام بـۆ هەمـوو جـۆرە باڵادەسـتی و هەیمەنەیـەک بەسـەر ئامـاژەی خاڵیـدا کاتـی و تێپـەرە؟. وەڵامـی ئـەم پرسـیارە لـە جەوهـەری تیورەکـەی لاکلاو و مۆفدایـە، سـەرکەوتنی ئامازەیـەک لەوەدایـە کـە ببێـت بـە هێزێکـی دەستنیشـانکەر و ناونـەر بـۆ ئامازەکانـی تـر، بـەڵام هـەر هێنـدەی دەلالەتێـک

وای لێهات ئامازەیەکی دی دەستنیشانبکات، دەکەوێتە ئەو بازنەیەوە کە شتێک بەجۆرێکی کۆنکرێت دیاریبکات و شتێک وەدەربنێت، شتێک وەرگرێت و شتێک فرێبدات، هەموو دەستنیشانکردنێکی کۆنکرێتیش دەرکردن و وەلاوەنانی دەستنیشانکردنێکی ترە «وەک لەسەرەوە گووتمان، هەموو پێناسەکردنێک نەفیکردنە». بەم پرۆسەیەش هەر گووتارێک کەوتە دەستنیشانکردنی مانای گووتارەکانی تر، واتە هەر کەوتە پراکتیککردنی سەرکەوتنی خۆی، شوێنی دەلالەتە گشتییەکە ونـدەکات و جێگا یۆنیفرسالەکەی خۆی دەدۆڕێنێت و دەبێت بە ناونانێک لە سیاقێکی دیاریکراودا «ریکس باتلەر.٦٢ ــ ٦٣»، واتە چیتر ئامازەیەکی خاڵی نابێت، ئامازەیەک کە دەبێتە خاڵی کۆکردنەوەی هەموو دەلالەتەکانی دیکە.

با بگەڕێینەوە بۆ لای سێوی سێهەم.

گەر بگەڕێینەوە بۆ سیفەتەکانی سەرەوە بەڕوونی دەبینین کە سێوی سێهەم ئامازەیەکی خاڵییە. بەوەدا سێوی سێهەم سێوێکی ئیفترازییە کە دەشێت هەر سێوێکی تر جێگای بگرێتەوە، کەواتە بەدیوێکی دیشدا ئامازە بۆ فرەیی ئامازە خاڵییەکان دەکات... بە کورتی سێوی سێهەم ئامازەیە بۆ شوێنی ئەو سێوە ئیدیالەی کە هیچ سێوێک پڕیناکاتەوە. ئەو مەحاڵەیە کە دەبێت هەموو هەوڵی بۆ بدەن و هەمیشەش هەر بە مەحاڵی بمێنێتەوە. چونکە بەبێ ئەو مەحاڵە واتە گەیشتنی کۆمەڵگا بە فۆرمێکی داخراو و گەیشتنی سیستمی گووتار بە شێوەیەکی نەگۆڕ، واتە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە و ڕیزبەندی و مانادان بە گووتارەکان، یاخود پرۆسەی «ئارتیکولەیشن» دەبێتە کارێکی نەشیاو و نەکردە.

گەر لێرەدا بگەڕێینەوە بۆ جیاوازی نێوان سێوی یەکەم و دووەم لەگەڵ سێوی سێهەمدا، دەبینین جیاوازی نێوان ئەم دووانە وەک جیاوازی نێوان ئامازەی ئاسایی و ئامازەی خاڵییە. سێوی یەکەم و دووهەم

هەڵگری دوو ماهییەت و دوو شوناس و دوو مانان، بەڵام سێوی سێهەم ئێمە دروستیدەکەین، واتە ماهییەتی نییە، ئێمە ماهییەت و شوناسی دەدەینێ... لێرەوە کە دەڵێین سێوی سێهەم سێوێکی خاڵییە، مانای نوکتەکە لەسەر کەسێک نییە کە سێ سێوی هەیە، بە پێچەوانەوە لەسەر کەسێکە کە دوو سێوی هەیە و سێوی سێهەم خۆی دروستیدەکات، سێوی سێهەم لە جێگایەکی ترەوە هاتووە، کەسی ناو نوکتەکە لە دەرەوەی سنووری ژوورەکە، لەدەرەوەی ئەو جەبرەی دیوارەکانی ژوورەکە دروستیانکردوە درەختێکی سێوی هەیە کە هەمیشە سێوی نادیار بەرهەمدەهێنێت. واتە ئەگەری یەکەم و دووەم دوو ئەگەرن کە هەر یەکەیان ماهییەتێکی دیاریکراویان هەیە، ئەگەری سێهەم ئەو ئەگەرەیە کە ئێمە دەتوانین دەلالەتی بدەینێ، ئێمە ماناکەی پڕدەکەینەوە. لێرەوە سێوی سێهەم تاکە ئەگەرە بتوانین گرێیبدەینەوە بە ئازادییەوە، تاکە ئەگەرە دەتوانین لە دیاریکردنی ماهییەت و شوناسیدا ڕۆڵێکمان هەبێت، یاخود بە وتەیەکی دی خۆمان لە باغی خۆمان دەریبهێنین. ئەگەری یەکەم و دووەم دوو ئەگەری جەبرین، ئەگەری سێهەم تاکە ڕووبەرێکە کە بواری ئەوەی تێدایە لە دروستکردن و مانابەخشی و کارپێکردنیدا کارێکمان هەبێت. سێوی سێهەم گەڕانەوەیە بۆ سێو بێهیچ مانایەکی پارتیکولار، بۆ هەناسەیەکی گشتی، بۆ هەوایەکی یۆنیفرسال کە ئێمە دەبێت لە دونیای خۆمان و لە ساتەوەختی مێژوویی خۆماندا مانای بدەینێ. سێوی سێهەم، سێوی ئازادییە... سێوێکە دەتوانین خۆمان دەستنیشانیبکەین و دروستیبکەین. سێوێکە بۆنی درەختی سێوی لێدێت، بۆنی باغێکی گەورەتری لێدێت کە دەتوانین سێوی تری لێوە بهێنین، بەڵام درەختێکە هەڵگری ئەو سیفەتەیە کە هەموو سێوەکانی سێوی سێهەمن... واتە ناتوانین بە یەقینەوە بەڵکو هەمیشە بە گومانەوە دەتوانین بیانخۆین.

# دوا تێبینی دەربارەی تاریکی

تاریکی ژوورەکە هێشتا تاریکییەکی ئاڵۆز و پڕ پرسیارە کە دەشێت مرۆڤ لە زیاد لە گۆشەنیگایەکەوە بیخوێنێتەوە و لێی بڕوانێت. پرسیارەکە ئەوەیە : ئاخۆ خامۆشکردنی چراکە بۆئەوەیە کەسە سێوخۆرەکە سێوی سێهەم بخوات «وەک لۆژیکی سەتحی و سادەی نوکتەکە پێماندەڵێت» یاخود بۆئەوەیە کەسە سێوخۆرەکە «سێوی یەکەم و دووەم» نەبینێت؟. لە هەموو بارودۆخە جیاوازەکاندا، تاریکی ناو ژوورەکە ئاماژە نییە بۆ کەسێک کە دەیەوێت کوێربێت، کە نایەوێت کارابێت و تێبگات، ئاماژە نییە بۆ ستایشکردنی نەزانین بەرابەر زانین. بەبڕوای من تاریکی ژوورەکە ئاماژەیەکی ڕەمزییە بۆ دوو پرۆسەی گرنگی ناو نوکتەکە خۆی. یەکەم: سێوی یەکەم و دووەم دوو ئەگەرن کەسە سێوخۆرەکە ناتوانێت دووبارەیانبکاتەوە، دوو سیستمن کە کەسی سێوخۆر بەدوای دەلاقەیەکدا دەگەڕێت لێیاندەرچێت. خامۆشکردنی چراکە لە ڕاستیدا بۆئەوەیە کە ئەو دوو ئەگەرە فڕیبدەینە دەرەوە و بەتەواوەتی بیانخەینە لاوە، تاریکی ژوورەکە لە جەوهەریدا تاریککردنی ئەگەری یەکەم و دووەمە، بۆئەوەی بتوانین کار لەسەر ئەگەری سێهەم بکەین. خامۆشکردنی چراکە کوژاندنەوەیەکی ڕەمزی سێوی یەکەم و دووەمە، تا سێوی سێهەم بتوانێت قورسایی ڕاستەقینەی خۆی دەربخات، کوژاندنەوەی دەلالەتە ماناداراەکانە، بۆئەوەی ئاماژە خالییەکان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن.

دووەم سێوی سێهەم شتێک نییە پێشتر ماهییەتی دیاریکرابێت، وەک گووتم ڕووبەرێکە ڕووناکی ئێمە ڕەنگی دەداتێ. بۆیە کوژاندنەوەی چرای ژوورەکە ساتێکی ڕێخۆشکەرە بۆئەوەی چرای خۆمان هەڵکەین، ساتی گواستنەوە و جێگۆڕکێیە دەکەوێتە نێوان جەبر و ئازادییەوە، نێوان

گووتارەکانی دی و گووتاری ئێمەوە، نێوان سیستم و دەرەوەیدا.

تاریکی لێرەدا تاریکی نەبوونی هەیمەنە و باڵادەستی هیچ گووتارێکە، گەڕانەوەی ئاماژەی خاڵییە بۆ دۆخی خاڵیبوون، پاکبوونەوەی ئاماژەی خاڵییە لە مانا پێشوەختەکان بۆئەوەی سەرلەنوێ ببێتەوە بە جێگای پێکدادان، بە مانایەکی دی ساتی دووبارە زەمینەسازییە بۆ سیاسەت، ساتی دووبارە ئیشکردنە تا بشێت ئامارە خالییەکان دووبارە بە مانای خۆمان پڕبکەینەوە. ساتی شتنی مێژووە بۆ پیسییەکانی خۆی، تا بتوانێت بیر لە فۆرمێکی دی بکاتەوە.

دۆلۆز و گیتاری لە جێگایەکدا دەنوسن «چەمکەکان ئاسمانێکیان نییە، دەبێت دابهێنرێن، دروستبکرێن، یاخود بخولقێنرێن. ئەوان هیچ نین بەبێ واژۆی ئەو کەسەی دروستیکردون» «دۆلۆز و گیتاری. ل.١٠». ئەم پێناسەیەی دۆلۆز و گیتاری بۆ چەمکەکان بۆ سێوی سێهەمیش راستە. سێوی سێهەم سێوێکە ئێمە دروستیدەکەین، دایدەهێنین و دەیخولقێنین... لێرەوە بە پێچەوانەی سێوی یەکەم و دووهەمەوە، ئەم سێوەیان تەنیا کاتێک مانای هەیە کە واژۆی ئەو کەسەی لەسەر بێت کە دروستیکردوە... لەم روانگەیەشەوە ئەو کەسە تەنهایەی کە لە ژوورێکی تەنهادا بەختی خۆی لەگەڵ سێ سێودا تاقیدەکاتەوە، سەمبولێکی گرنگی ئەو دۆخەیە کە هەموومان چ وەک فەرد و چ وەک کۆمەڵگا تێیدا دەژین. بۆئەوەی بشێت و بتوانین ئازادی خۆمان بژین، هەموو مەحکومین بەوەی سێوێکی سێهەممان هەبێت، واتە سێوێکی سێهەم بخولقێنین... سێوی سێهەم ئەلتەرناتیڤی برسێتی نییە، بەڵکو ئەلتەرناتیڤی مردنە، بەجۆرێک دەکرێت بە ڕۆشنی بڵێین، هیچ مرۆڤێک و هیچ کۆمەڵگایەک بەبێ سێوی سێهەم ناژی. بەڵام وەک دۆلۆز و گیتاری دەڵێن، ئەو سێوە ئاسمانی نییە «واتە خودا و خولقێنەری نییە» بەڵکو ئێمە دروستیدەکەین و دەیخولقێنین، بەبێ واژۆی ئێمەش مانا و نرخێکی نییە.

# سەرچاوەکان

Ernesto Laclau & Chantal Mouffe. Hegemonie und radikale Demokratie. Zur Dekonstruktion des Marxismus. Passagen Verlag. Wien. 2006.

Oliver Marchart .)Hrsg) .Das Undarstellbare der Politik. Zur Hegemonietheorie Ernesto Laclaus. Turia und Kant. Wien . 1998

Ernesto Laclau. Emanzipation und Differenz. Turia und Kant. Wien. 2002

Ernesto Laclau. Was haben leere Signifikanten mit Politik zu tun؟ In: Mesotes - Zeitschrift für philosophischen Ost-West-Dialog 2.1994. S. 157-165

Martin Nonhoff. (Hrsg.) Diskurs- radikale Demokratie- Hegemonie. Zum politischen Denken von Ernesto Laclau und Chantal Mouffe. Transcript . 2007

Christian Flatz , Sascha Felgitsch. (Hrsg.) Dimen-

sionen einer neuen Kultur des Politischen. Vs Verlag . Wiesbaden. 2006

Gilles Deleuze. Felix Guattari. Was ist Philosophi . Suhrkamp. Frankfurt/Main.1996

Rex Butler. Slavoj Žižek zur Einführung. Hamburg. Junius.2006

Slavoj Žižek .Auf verlorenem Posten . Suhrkamp. Frankfurt/Main. 2009

Slavoj Žižek. Die Tücke des Subjekts .Suhrkamp. Frankfurt/Main. 2001

# ئایا دەتوانین بە کۆمەکی «لاکان» شۆڕشگێڕ بین؟

## «ڕێگایەک بەرەو دونیای جاک لاکان»

تێگەیشتن لە فیکری نوێ، بەبێ تێگەیشتن لە جاک لاکان کاری نەکردەیە، بەڵام تێگەیشتنیش لە لاکان یەکێکە لە هەرە ئەو کارە سەخت و دژوارانەی ڕووبەڕووی هەر ڕۆشنبیرێک ببێتەوە. لێرەوە دەستبردن بۆ لاکان، هەمیشە کارێکی پڕ مەترسییە، بەڵام لەوە پڕ مەترسیتر دەست نەبردنە بۆ لاکان. چونکە تێگەیشتن لە لاکان، چیتر تەنیا تێگەیشتن نییە لە ڕێبازێکی نوێکەرەوە بۆ فرۆید، بەڵکو تێنەگەیشتنە لە سیستمێکی زاراوەیی کە ژمارەیەکی گەورە لە توێژەرەوە و فەیلەسوفانی نوێ بە بەربڵاوی بەکاریدەهێنن، کە گرنگترینیان کەسانی وەک سلاڤۆ ژیژیک و ئەرنستۆ لاکلاون، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەوان دواترین فەیلەسوف نین کە ئەو پردە لەگەڵ لاکاندا دروستدەکەن. کێشەی هەرە گەورەی لاکان تەنیا ئەو ئاڵۆزییە نییە کە چەمکەکانی ئەو و سیستمە ناوەکییەکەی فیکری ئەوی پێدەناسینەوە، بەڵکو ئەو گۆڕانە گەورەیەی مانایە کە هەندێک چەمک تەواو لەو شێوەڕێیە دەردەکات، کە پێشتر پێی ئاشنابووین، لەوانەش گرنگتر ئەو تەحەدا و پرسیار و ڕوانگە تازانەیە کە لەگەڵ لاکاندا دەربارەی کۆمەڵێک کێشەی گرنگ ڕووبەڕووی دەبینەوە، ئیدی لە نیگامانەوە بۆ سوبێکتەوە بیگرە تا دەگەینە سەر تێگەیشتنمان لە واقیع و خۆشەویستی و ژن... بە کورتی لاکان سیستمێکی زاراوەیی جیاواز و

وێنەیەکی جیاوازی دونیای پێیە کە لە سیستمە فیکرییەکانی پێش خۆی ناچێت، ئەمەش وادەکات گەیاندنی ئاسان نەبێت. هەر لێرەشەوە ناسینی فۆکۆ لە لای ئێمە و لە خۆرهەڵاتیشدا بە گشتی زۆر پێش ناسینی لاکان دەکەوێت، نوسین لەسەر زۆر لە بیریارە مۆدێرنەکان لە نوسین لەسەر لاکان ئاسانترە. بەڵام لەگەڵ ئەو سەختی و ئاڵۆزییەی لاکانیشدا، خۆدزینەوە لە لاکان جۆرە خۆخەڵەتاندن و خۆ بەهەڵەدابردنێکی گەورەیە. لەم باسەدا من هەوڵدەدەم وەڵامی یەک پرسیار بدەمەوە: ئەویش ئەوەیە ئاخۆ دەتوانین بە کۆمەکی لاکان شۆڕشگێڕ بین؟. لاکان کە باوەڕی بە سوبێکت نییە، باوەڕی بەوە هەیە مرۆڤ گیرۆدەی سیستمێکی ڕەمزی و ڕێکخستنێکی ڕەمزییە کە ئەوانی دی دروستیانکردوە، لە یەکێک لە ڕستە هەرە بە ناوبانگەکانیشیدا دەڵێت «ئارەزووی مرۆڤ، ئارەزووی ئەوانی دییە» واتە مرۆڤ خۆی خاوەنی ئارەزووەکانی خۆشی نییە. ئایا دەشێت جۆرە پرسیاری وا لە بیریارێکی لەمجۆرە بکرێت؟. بەڵام بەرلەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە لەسەر لاکان بدەمەوە، دەبێت وەڵامی پرسیارێکی سادەتر بدەمەوە.

ئاخۆ مەبەست لە وشەی شۆڕشگێڕ خۆی چییە؟.

تێگەیشتنی تەقلیدی لە شۆڕشگێڕ بەو چەشنەی لە کولتووری خۆرهەڵاتی سەدەی بیستدا بەرقەرارە، بریتییە لە جۆرە ڕەتکردنەوەیەکی توندی سیستمی سیاسی و پەیوەندی سیاسی نێوان هێزە ئەتنی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان، کە دەگاتە سنووری خۆڕێکخستن و دەستبردن بۆ چەک. بەڵام لە جەوهەردا سەیربکەیت، ئەمجۆرە تێگەیشتنە لە چەمکی شۆڕشگێڕ لە دوا دەرەنجامدا هەمان سیستمی کۆن بە فۆرمێکی نوێ بەرهەمدەهێنێتەوە، ڕوخساری بکەرەکانی ناو پێکهاتی دەسەڵات دەگۆڕێت، بێئەوەی بتوانێت ڕوخساری ڕاستەقینەی دونیا دەستکاریبکات. سەردەمانێک پرۆژەی سۆسیالیستی لەسەروو هەموو ئەو پرۆژانەوە بوو

کە ڕادیکال دەستکاری سیستمی دەکرد، هەرەسی ئەم پرۆژەیە و دووبارە گەڕانەوەی بۆ میتۆدی سیستم پەرستی، ئەوەی سەلماند کە سیستم هێزێکی کاراتر و سروشتێکی هەمەگیرتری هەیە لەوەی ڕۆحی شۆڕشگێڕانەی تەقلیدی، یاخود شۆڕشگێڕانی کلاسیک چاوەڕوانیاندەکرد. بە کورتی گۆڕینی دەسەڵات یان گۆڕینی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، بەجۆرێکی ئۆتۆماتیک نابێتە مایەی گۆڕینی سیستم، لە بەرئەوەی خودی ئەو تێڕوانینە بۆ شۆڕشگێڕی تەقلیدی، لەسەر تێنەگەیشتن لە سیستم و چۆنێتی ئیشکردنی لە ناو زمان و پێکهاتی دەرونی و سروشتی ئارەزوو و ستراکتورە زهنییەکاندا بونیادنراوە. لێرەوە فیکرێکی شۆڕشگێڕ کە لەسەر دروستکردنی وێنەیەکی هەڵە بۆ مرۆڤ و دونیا دروستبووبێت، سیستم کورتبکاتەوە بۆ هەندێک ڕەهەند و دیاردەی ناو بونیادی سەرەوەی پێکهاتی کۆمەڵایەتی، لە جەوهەریدا گەلێک گرێ و بەرزونزمی گرنگی دیکە فەرامۆشدەکات کە بە تەنیا ناکەونە ناو کایەی سیاسی و ئابوورییەوە. فیکرێکی شۆڕشگێڕ کە لەسەر وێنەیەکی گشتی بۆ مرۆڤ و ژینگە دەرونی و ڕەمزییەکەی بونیادنەنرابێت، جگە لەوەی کە دەتوانێت دەستکاری ڕووکەش لە سیستمە تۆتالیتار و فرەگیرەکاندا بکات، ناتوانێت هیچی دیکە بکات. فیکری شۆڕشگێڕ دەبێت لەسەر وێنەیەکی ڕاستەقینە بۆ مرۆڤ دروستبووبێت، واتە دەبێت لەو پرسیارەوە دەست پێبکات : چی مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ و وای لێدەکات بە جۆرێکی تایبەتی ببینێت و بیربکاتەوە؟ نەوەک لەو پرسیارەوە کە چەوساندنەوە چییە؟. پرسیاری چەوساندنەوە و ئازادی لە ساتی دووهەمدا دێنە پێشێ. سەرەتای سەرەتا بۆ هەر فیکرێک بیەوێت ئیش لەسەر گۆڕینی ژیان بکات، ئەوەیە کە بپرسێت مرۆڤ چییە؟. هەر فیکرێکیش بیەوێت لەسەر مرۆڤ ئیشبکات، ناتوانێت لاکان بخاتە ئەو لاوە. لێرەوە شۆڕشگێڕێتی نوێ، لە بنەڕەتدا لەسەر تێپەڕاندنی سیستم ئیشدەکات، بە گەڕانەوە بۆ پرسیار لە مرۆڤ.

فیکری شۆڕشگێڕی کلاسیکی لەسەر بیرۆکەی «بە هەشتی سەر زەوی» «کۆمەڵگای بێناکۆکی» «خۆشەویستی مرۆڤەکان بۆ یەکدی» «پاشەڕۆژی ڕوناک» دروستبووبوو. بەڵام هەر فیکرێکی نوێ بیەوێت بیر لە دونیای نوێ بکاتەوە، دەبێت تا ئەندازەیەکی زۆر تۆزی خورافی و میتۆلۆژی و ناعەقلانی پشت ئەو تێزانە بتەکێنێت و لە جێگایەکی دیکەوە دەست پێبکاتەوە. لە دوای هەرەسی کۆمۆنیزم و گەیشتنی فیکری شۆڕشگێڕی کلاسیکی بە بونبەست، مەسەلەی تەکاندنی تۆزی میتۆلۆژی لەسەر فیکر و خەیاڵی شۆڕشگێڕانە، بۆتە شتێکی حەتمی. ئێستا هەموو دەزانین کە گۆڕینی سیستم و گۆڕینی مرۆڤ زۆر لەوە سەختترە کە لە فەلسەفەی سەدەی نۆزدەدا پێشبینیدەکرا. ئێستا چیتر مەسەلەی تێپەڕاندنی سیستم ئەو سروشتە بەڵگە نەویستەی نییە کە پەنجا ساڵ یان سەد ساڵ لەمەوبەر هەیبوو، ئەمڕۆ دەزانین چ سیستم و چ مرۆڤ دوو پێکهاتی لەوە ئاڵۆزترن، هیچ تیورەیەکی شۆڕشگێڕ بتوانێت لە هێڵکارییەکی سادەدا نەخشەی گۆڕانیان بکێشێت. واتە سەرەتا دەبێت خۆمان لە خورافەتی تیورەیەکی شۆڕشگێڕی سەرتاسەری ڕزگاربکەین کە لەسەر ئەوە ئیشبکات بتوانێت وێنەیەکی دروستی دونیا و مرۆڤ بکێشێت و دواتر لەسەر ڕۆشنایی ئەو وێنە سەرتاسەرییە پڕۆژەی ڕزگارکردنێکی خورافی دابمەزرێنێت. ئەمڕۆ دەبێت مەسەلەی ئەگەری تێپەڕاندنی سیستم و هیوای شکاندنی لەسەر بنەمای تیوری نوێ دابڕێژینەوە. بە بڕوای من سیستمی تۆتالیتار بەرهەمی تیورەی شۆڕشگێڕی تۆتالیتارە، بۆیە هەر فیکرێکی سیاسی کە لەسەر قاچی یەک تیورەی شۆڕشگێڕ بوەستێت، لە دوا دەرەنجامدا لە ستەمدا تەواودەبێت. لێرەوە تیورەی شۆڕشگێڕی سەرتاسەر دەروازەیەکی گرنگی ستەمە، چونکە لەسەر بەلاوەنانی هەموو ئەگەرە تیورییەکانی دیکە بونیادنراوە، هەر بۆیە فیکری شۆڕشگێڕی کلاسیکی لە ئەتیکێکی دژە ئازادی و ستەمکاردا کۆتاییهات. من وادەبینم

کە دیموکراسیزمی تیوری گرنگە بۆ هەر هێزێکی نوێ بیەوێت دونیا بگۆڕێت. سەرەتا زۆر گرنگە بزانین کە چەمکی شۆڕشی سەرتاسەری و تیورەی سەرتاسەری دوو چەمکن بەرەو ڕێگایەکی داخراومان دەبەن. ئێستا پێویستمان بەوەیە بۆ ڕەهەندە نەفیکەر و ناڕامەکەی مرۆڤ بگەڕێین، ئەوە بۆخۆمان بسەلمێنین کە فیکری شۆڕشگێڕی دەتوانێت لەسەر تێگەیشتن لە مرۆڤەوە دەست پێبکاتەوە، نەوەک تەنیا لە تێگەیشتنەوە لە سیستەمی بەرهەمهێنان. شۆڕش شتێک نییە یەکجار لە مێژوودا ڕووبدات و بەدوایدا ئیدی هەموو بە ناچاری خەریکی پاراستنی سیستەمی شۆڕش و ئایدۆلۆژیای شۆڕش و سەمبولەکانی شۆڕش بین، وەک فیکری کۆمۆنیستی دایڕشت و بە میرات بۆ بزووتنەوەکانی جیهانی سێهەمیشی بەجێهێشت. شەڕ لەگەڵ سیستەمدا شەڕێکی هەمیشەیی و سەخت و فرەڕەنگ و فرە ستراتیژ و فرە ئاستە، کە بەردەوام پێویستی بە پێناسەکردنەوەی سیستەم و سنوورەکانی، سوبێکت و دروستبوونی لە هەناوی سیستەمدا هەیە... لێرەوە هیچ شۆڕشگێڕێک نییە بتوانێت تەنیا لە ڕێگای سیاسەتەوە شۆڕشگێڕ بێت، بەڵکو تەنیا لە ڕێگای ناواخنکردنی ئەو ئاستۆ تازانەوە دەکرێت لە گۆڕان نزیک ببینەوە کە لەسەر تێگەیشتنێکی نوێ بۆ مرۆڤ بونیادنرابن. لەسەدەی بیستدا قوتابخانەی فرانکفۆرت و نوێنەرە جیاوازەکانی هەوڵێکی گەورەیاندا کە تێگەیشتن لە دەرونی مرۆڤ و تێگەیشتن لە کۆمەڵگا لە ناو یەک تیورەی سیاسیدا کۆبکەنەوە، ئەمڕۆش دوای هەرەسی مارکسیزمی حیزبی، ئیشکردن لەسەر ئەو مۆدێلە «کە لای سلاڤۆ ژیژیک لەفۆرمێکی نوێدا دەیبینینەوە» تاکە دەروازەیە بۆ زیندوو ڕاگرتنی شتێک لە ڕۆحی یاخیبوون و دروستکردنەوەی وێنەی مرۆڤ بەجۆرێک بتوانێت لە خۆیدا ئەگەری دونیای تری پێبێت. بە کورتی لە ئێستادا پێداویستی شۆڕش بۆ زانست و فەلسەفە لەوە گەورەترە، بکرێت لە خەتێکی ئایدۆلۆژی یان تیوری یان فەلسەفیدا

کورتبکرێتەوە، لێرەوە وەک سەرەتا دەبێت بزانین شۆڕشگێڕبوون چیدی هەڵوێستێکی سیاسی نییە لە سیستمێکی سیاسی دیاریکراو، بەڵکو هەڵوێستێکی فەلسەفییە کە تەنیا بە کۆمەکی ژمارەگەلێکی زۆر لە دەرەنجامی زانستی و فەلسەفی جیاواز جیاواز دەتوانین بۆ ساتێکی دیاریکراو فۆرم و ناوەرۆکی بدەینێ، شۆڕشگێڕبوون هەڵوێستێکە بۆئەوەی دەستکاری دونیا بکات، دەبێت بەردەوام دەستکاری خۆی بکات، بۆئەوەی فیکرێک بتوانێت دونیا بگۆڕێت دەبێت بەردەوام خۆی بگۆڕێت... شۆڕشگێڕبوون لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە فیکری شۆڕشگێڕ خۆی لە ناو خۆیدا بۆ مەحاڵ بگەڕێت، دوا فۆرمی نەبێت، نەگاتە دوا ئاقاری تیوری. تیورەی شۆڕشگێڕ هەمیشە تیورەیەکی ناتەواوە، تەعبیر لە مەحاڵی دواشۆڕش و دواتیورە دەکات. ئەوەی کە پێیوایە تەنیا لە ڕێگای سیاسەت و حیزبایەتی تەقلیدییەوە دەتوانێت شۆڕشگێڕ بێت بە هەڵەیەکی گەورەدا دەچێت. سیاسەت تەنها بەشێکی بچوکی سیستمی تەعبیرکردنە لە شۆڕش. لە بەرئەوەی خواستی شۆڕشی ڕاستەقینە بە جۆرێک لە جۆرەکان دەکەوێتە ئەوبەری خواستی زمان و ئەوبەری توانای تەعبیر، شۆڕش لەو دروشمانەدا بەرجەستە نابێت کە بەرزیاندەکەینەوە، بەڵکو لەو دروشمانەدا بەرجەستەدەبێت کە ناتوانین بەرزیانبکەینەوە، ئەو دروشمانەی دەکەونە ئەوبەری سنووری ڕێپێدانی سیستم و دەرەوەی سنووری سیستمە ڕەمزییەکەی کۆمەڵگا. بە کورتی پێداویستی و پرسیارەکانی فیکری شۆڕشگێڕ سنووری کایەی سیاسی تێدەپەڕێنێت و لە فیکری سیاسی گەورەترە و هیچ کات هەموو ڕەهەندەکانیشی لە ناو سیاسەتدا جێگایان نابێتەوە. چیدی شۆڕش ئەوە نییە کە گروپێک بە ناوی هەموومانەوە حوکم بگرنە دەست، چیدی شۆڕش یەک پەلامار و یەک جەنگ نییە، بەڵکو بیرخستنەوەیەکی بەردەوامی ئەو لەقبوون و درز و نوقسانیانەیە کە هیچ کات سیستم ناتوانێت پڕیانبکاتەوە، چیدی

شۆڕش تەنیا دەستبردن نییە بۆ چەک، بەڵکو بەبیرهێنانەوەی ئەو مەحاڵانەیە کە دەکەوێتە دەرەوەی توانای سیستمەوە، گۆڕینی ئەو ئەگەرانەی ناو هەناوی ژیانە بۆ هێزی گۆڕانکار و زیندووکردنەوەی کولتووری دۆڕاوەکانی جارانیشە بۆئەوەی لەمڕۆدا دووبارە دەنگ بەرزبکەنەوە. ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموومان دەبێت ببین بە فەیلەسوف بۆئەوەی شۆڕشگێڕبین، بەڵکو مانای ئەوە شوناسی شۆڕشگێڕ چیدی بە تەنیا ملکەچی پێناسەی سیاسی نییە، وە شۆڕشگێڕ لە یەک کایەوە سەردەرناهێنێت و جیهان لە یەک پنتەوە ناگۆڕدرێت. هەتا لای فەیلەسوفێکی وەک ژیژیک کە هەوڵدەدات ئەو قەناعەتانە بە جۆری تایبەتی خۆی تێبپەڕێنێت و فیکرێکی شۆڕشگێڕی نوێ بونیادبنێت کە کەلەپوری «هیگڵی - مارکسی» لە یاد نەکات، خۆبەستنەوە بە یەک کانگای فیکرییەوە نابینین، ژیژیک نایەوێت بە تەنیا قورسایی مارکس و لینین فەرامۆش نەکەین، بەڵکو دەیەوێت هەمیشە دیکارت و لاکان و کەلەپووری فرۆیدیمان لە یادبێت، لەم پاشخانەشەوە خوێندنەوەی تەواو نوێ و ڕادیکال بۆ ڕووبەرێکی بەرینی مێژووی کولتووری خۆرئاوادەکات، ئیدی لە دیکارتەوە بیگرە بۆ هیتشکۆک، لە کانتەوە تا دەگاتە فلیمسازەکانی هۆلیوۆد. کێشەکە لەوەدایە کە مرۆڤ نابێت دوو شتی بنەڕەتی تێکەڵبکات: ئەوەی بڵێین فیکری شۆڕشگێڕی مردوە و مۆدێلی کەپیتالیستی ئەبەدییە شتێکە، بشڵێین فیکری شۆڕشگێڕی کلاسیکی و شۆڕشی تاک تیورە و سەرتاسەری کۆتاییهاتووە شتێکی دیکەیە. هەر گرێدانەوەیەکی میکانیکی لە نێوان ئەم دوو تێزەدا ڕەنگە دەرەنجامی ترسناکی هەبێت... یەکێک لە دەستکەوتە هەرە گەورەکانی فیکری فەلسەفی لەسەدەی بیستدا ئەوەبوو کە توانی دیلکردنی فیکری شۆڕشگێڕ لە سنووری تیورەیەکدا بشکێنێت، هەر کاتیش فیکری شۆڕشگێڕ لە یەک تیورەوە سەری دەرنەهێنا و بوو بە کارێکی پێکەوەیی

لە نێوان کۆی زانستەکاندا، لەوە دەکەوێت فۆرمێک و چەقێک و شێوەیەکی هەبێت و دەبێتە بە گەمەیەکی هەمیشەیی، واتە دەرگا لەسەر پرۆسەی شۆڕشی هەمیشەیی دەکاتەوە، شۆڕشێک کە فۆرمەکانی دەگۆڕێت، بەڵام هەرگیز کۆتایی نایەت. بە کورتی گرنگی لاکان لەوەدا دەبینمەوە کە زەمینەی گەیشتنمان بە بیرۆکەی «شۆڕشی بەردەوام» بۆ خۆشدەکات، کاتێک «ئارەزوو»ی مرۆڤ بە «مەحاڵ»ـەوە گرێدەدات، وە ئەو ڕەهەندەی مرۆڤمان وەیاددەهێنێتەوە کە هەمیشە ناتەبا لەگەڵ جیهاندا دەمێنێتەوە. هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە لە جیهانێکدا بژین، بیرۆکەی شۆڕشی تێدا نەبێت، بەڵام مارکس نەیتوانی لە سێبەری ئەو دونیا ترسناکە ڕزگارمانبکات، ڕاستە مارکس فەیلەسوفی شۆڕش بوو، بەڵام مارکس مرۆڤ وەک ناتەبایەکی ئەبەدی لەگەڵ جیهاندا وێناناکات، شۆڕشی مارکسی لە جێگایەکی مێژوودا دەوەستێت و کۆتاییدێت و دەکرێت مژدەی سەرهەڵدانی دونیایەکی بێ شۆڕش بە مرۆڤ بدات. بەڵام لاکان بیریاری ئاماژەکردنە بۆ خواستێک کە هەرگیز تێرنابێت، بۆ وێنەیەک کە ناگیرێت، بە مانایەکی دیکەش بیریاری ئاماژەکردنە بۆ شۆڕشێک کە هەرگیز ناگاتە کۆتایی.

ئەوەی لەم باسەدا مەبەستمە، لە پاڵ ناساندنی هەندێک چەمکی گرنگی لاکاندا، پەنجە بخەمە سەر ئەو دیوەی فیکری لاکان کە بە چەمکی تێپەڕاندنی سیستمەوە بەندە... واتە تەنیا لاکان ڕاڤە ناکەین، بەڵکو ئەو ڕەهەندەی فیکری لاکان گرنگ دەگرین کە دەشێت لە تێگەیشتن لە دۆخی مرۆڤ و جەوهەری سیستم و ئەگەری تێپەڕاندنیدا یارمەتیمانبدات. بە کورتی لێرەدا کەمێک لە چیرۆکە ژیژیکییەکە «بە ئامارە بۆ تەفسیرکردنەوەی ژیژیک بۆ لاکان» دەگێڕینەوە، چیرۆکی دۆزینەوەی هەندێک ڕەگەزی ڕزگارکەر لەلای لاکان کە دەرگامان بۆ تێگەیشتن و تێپەڕاندنی سیستمی ڕەمزی ناو دونیای نوێ بۆ دەکەنەوە.

ئـەو تێزەیـەی دەمانگەیێنێتـە ئـەو بڕوایـەی هەرەسـی دەسـەڵات گرێـدراوی ئاڵوگۆڕی گـەورەی نـاو سیسـتمی ڕەمزییـە... بەبـێ شـکاندنی ئـەو زیندانـە سـەمبولییەی کـە سیسـتم لـە مێژوویەکـی درێـژدا خولقاندویێتـی، گەیشـتن بەودیـوی سیسـتم کاری نەکردەیـە. پرسـیارەکە لێـرەدا ئەوەیـە ئاخـۆ لای لاکان دەتوانیـن ئـەو درزە گەورەیـە بدۆزینـەوە کـە سیسـتم ناتوانێـت دایبخـات، ئـەو درزە سـەرەکییەی ئامـاژە بـۆ هێزێکی نەگەتیـڤ و نەفیکـەری نـاو سیسـتم دەکات، هێزێـک بـەردەوام ئـەو ڕاسـتییەمان بیردەخاتـەوە کـە سیستم «هەمـوو سیسـتمێک» ناتـەواو و قابیلـی تێپەڕاندنـە؟. ژیژیـک لـە هـەر کـەس ڕوونتـر تەعبیـری لـەو ئاڕاسـتەیە کـردوە کەدەبێـت فەلسـەفەی نـوێ بیگرێتـە بـەر کاتێـک دەڵێـت «ئەرکـی فەلسـەفە گەڕانەوەیـە لـە واقیعـەوە بـەرەو ئەگـەر»« باتلـەر. ٥٤».

ڕۆحـی نوێـی شۆڕشـگێڕی لەسـەر ئـەو ڕاسـتییە دروسـتبووە کـە مانـەوە لـە چوارچێـوەی واقیعـدا، زەمینـەی هیـچ گۆڕانێکـی ڕیشـەییمان ناخاتـە بەردەسـت، ئـەوەی گرنگـە شـکاندنی دەرگای نەفییەکـی گەورەتـرە کـە بـەرەو ئەودیـوی سیسـتم بمانبـات، واتـە ئـەوەی گرنگـە دۆزینـەوەی دەروازەیەکـە لـە واقیعـەوە بمانگێڕێتـەوە سـەر خاکـی ئەگـەر، دەروازەیـەک سـوبێکت لـە پاشـکۆیەتی ئۆبێکـت ڕزگاربـکات و وەک هێزێکـی خولقێنـەر و ئـازاد بیخاتـەوە سـەر شـانۆ.

# لاکان و کێشەی سوبێکت

لاکان بە یەکێک لە دوژمنانی لۆگۆسەنتریزم دەناسرێت، بەرامبەر ڕستە بە ناوبانگەکەی دیکارت کە دەڵێت «من بیردەکەمەوە کەواتە هەم»، ئەو ڕستەیەکی سەرەکی و نەیاری هەیە کە دەڵێت «من لەو جێگایە نیم کە بیری لێدەکەمەوە، کەواتە لەو جێگایەم کە بیری لێناکەمەوە». بە مانایەکی ئاسانتر سوبێکتی مرۆڤ لەو جێگایەدا نییە کە بیردەکاتەوە، واتە بیرکردنەوەیەک کە بە ناوی سوبێکتەوە دەدوێت، بیرکردنەوەی سوبێکت خۆی نییە، وە سوبێکتیش کە لە شوێنی بیرکردنەوەی خۆیدا دەرنەکەوت کە تێیدا بیردەکاتەوە، ئەوا لەو جێگایەوە سەردەردەهێنێت کە هێشتا بیرکردنەوە تێیدا نەخولقاوە. دیارە قورسە لەم تێزەیە بگەین بەبێ ئەوەی تەواوی تێڕوانینی لاکانمان دەربارەی سوبێکت لە بەرچاوبێت. سوبێکتی لاکانی لە نیگای یەکەمدا وەها دیارە وەک تەواو دژی سوبێکتی دیکارتی بێت، سوبێکتی دیکارتیش سەرەتا وادەردەکەوێت وەک ئەوەی بیرکردنەوە بکاتە پێشمەرجی سوبێکت، وەک ئەوەی بوون و نەبوونی مرۆڤ تەنیا بە «بیرکردنەوە یان بیرنەکردنەوە» وە گرێدرابێت، چونکە کە دیکارت دەڵێت «من بیردەکەمەوە کەواتە هەم» دیوی ئەودیوی ئەم هاوکێشەیە ئەوەیە «من بیرناکەمەوە کەواتە نیم». واتە بیرنەکردنەوە مانای عەدەم، مرۆڤبوونیش مانای بیرکردنەوە. خودی ئەم تێزەیەی دیکارت دەبێت بە داڕێژەرێکی بنەڕەتی ئەوجۆرە عەقڵانییەتەی کە بە

«عەقلانییەتی دیکارتی» ناسراوە، عەقلانییەتێک بەرپرسە لەگەڵێک ڕوکاری ناو مۆدێرنە و شێوەنیگای ئێستای ئێمە بۆ دونیا. هەروەها لە بنەڕەتەوە ئامارە بۆ جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان فەلسەفەی ڕۆشنگەری و ڕۆحی دەرونشیکاری نوێدا دەکات، ئەو مرۆڤەی دیکارت لەسەر عەقڵ رایدەگرێت و ناویدەداتێ، لای فرۆید کەرتدەبێت بۆ چەند بەشێکی وەک «نەست» و «هۆش» و «پێشهۆش». ئالان یورنافێل دەڵێت کاتێک فرۆید بۆ یەکەمجار قاچی لەسەر خاکی ئەمریکا دانا گووتی «من لەگەڵ خۆمدا، تاعوونم بۆ هێناون». «یورنافێل. ل.٥١». لە ڕاستیدا ئەندێشەی فرۆیدی بۆ سیستمی بیرکردنەوەی کۆن و بۆ فەلسەفەی تەقلیدی سیفەتی تاعوونی هەیە، بەڵام ئەم تاعوونە تەنیا پەلاماری بیرکردنەوەی ترادسیۆنی و دینی نادات، بەڵکو گورزە گەورەکەی بەر سیستمی فەلسەفی دەکەوێت، چونکە کەمتازۆر درزێکی گەورە دەکاتە نێوان فەلسەفە و دەروونناسییەوە. فەلسەفە وەک ئەو بوارە دەناسرێت کە بایەخ بە هوشیاری و خود و حەقیقەت دەدات، کەچی دەرونشیکار دەبێت بە ڕووبەرێکی جیاواز کە بایەخ بە نەست و ناهوشیاریی و خەون دەدات. لێرەوە سەیر نییە گەر جۆرە ڕقێکیش لە نێوان هەندێ دەرونشیکاران و فەیلەسوفاندا ببینین. لاکان زۆرجار ئەو قێز و بێزارییەی خۆی لە فەلسەفە نیشانداوە، لە جێگایەکدا دەڵێت «من نافەلسەفێنم، چۆن خۆم لە تاعوون دەپارێزم، ئاوها خۆم لە فەلسەفە دەپارێزم» «ڕۆژنامەی نیوزیورخیشە تزایتونگ. ژمارەی ٢٥ ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٥». دیارە فیکری لاکان تەواو پێچەوانەی ئەو قسەیە ئاشکرادەکات، تێزەکانیشی بەبێ کۆمەک و کاریگەری فەلسەفەی هیگڵ و باتای ئەو شێوە و نێوەیان وەرنەدەگرت. دیارە هاتنی نەست بۆ ناو بازنەی تێگەیشتن لە مرۆڤ، گورزێکی گرنگ بوو بۆ عەقڵ پەرستی و لۆگۆسەنتریزم، واتە بۆ هەموو فەلسەفەیەک لەسەر گەورەیی عەقڵ پێدابگرێت و بیخاتە سەنتەری تێگەیشتن و وێناکردنی مرۆڤەوە. لەوەش

بترازێت هاتنی نەست بۆ ناو بازنەی وێنەی مرۆڤ، هەر ئەوە دەرناخات کە عەقڵ «گەورەی ماڵی خۆی نییە»، بەڵکو ئەوەش ئاشکرادەکات کە مرۆڤ «ئازاد» نییە، چونکە گەر مرۆڤ بە پاڵنەر و هێزە ناوەکی و هۆکاری ڕەفتارەکانی خۆی ناهوشیاربێت، ئیدی ئازادی مانایەکی نامێنێت. کەوابێت هەمیشە لەدەرەوەی ئیرادەی منەوە هێزێکی نادیار هەیە کە جڵەوی من دەکات، بەوەشدا من بوونەوەرێکم جڵەوی خۆم بە دەست هوشیاری خۆمەوە نییە کەواتە ئازادی وشەیەکی بێمانا و بێناوەڕۆکە، چونکە ئازادی مانای هەڵبژاردنی هوشیارانە، مانای ئیرادەیەک کە گرێدراوی خودێکی سەربەست و بیرکەرەوەیە کە خۆی خاوەنی بڕیاری خۆیەتی. لێرەوە نەست کێشەیەکی ڕاستەقینە لە فەلسەفەدا دەخولقێنێت، کە پابەندی دوو کۆڵەکەی گرنگی فەلسەفەیە، عەقڵ و ئازادی. بە کورتی دیکارت کاتێک هەموو شتێک دەخاتە بەر گومانەوە، یەک شت دەمێنێت کە بە چەقی هەموو بڕوایەک و بە سەرەتای هەموو یەقینێکی ڕەهای دەزانێت، ئەویش بوونی «سوبێکتێکی بیرکەرەوە» یە. دوای دیکارت بیرکردنەوە لە مرۆڤ لە بڕێکی زۆر لە ئاڕاستە فەلسەفییەکاندا بێ گەڕانەوە بۆ کۆجیتۆی دیکارتی کاری نەکردەیە، بە چەشنێک زۆر لە فەلسەفەکانی دوای دیکارت گەر ڕاستەوخۆش سەروکاریان لەگەڵ سوبێکتی دیکارتیدا نەبێت، ناڕاستەوخۆ و وەک دراوێکی پێشینە، ئەم سوبێکتەیان لە ناوەندی بینینی خۆیاندا ناواخنکردوە. هەتا لای فرۆیدیش «منێکی هوشیار و بیرکەرەوە» زامنی ئەوەیە مرۆڤ بەرقەرار و ئارام بێت و نەکەوێتە دۆخی شێتییەوە. بەڵام لاکان ڕەهەندێکی گرنگی دیکەی کێشەی سوبێکتی دیکارتیمان بۆ بەیاندەکات، کاتێک مەسەلەی «زمان» دەهێنێتە پێشێ. بەوەدا بیرکردنەوەیەک نییە لەدەرەوەی زمان، کەواتە ئەو تێزە دیکارتییەی دەڵێت «من بیردەکەمەوە» بە دیوێکی دیدا ماناکەی ئەوەیە «من زمان بەکاردەهێنم»، واتە من و بیرکردنەوە بەبێ زمان بوونمان

نییە. بەڵام زمان موڵکی من نییە، زمان سیستمێکە پێش «من» دەکەوێت و لە ریزێک ئامازە و مانا دروستبووە کە من دروستم نەکردون و پێشوەخت بەسەر مندا سەپاون. واتە ئەو شتەی من دەتوانم، منێتی خۆمی لێوە دەست پێبکەم، موڵکی من نییە. لێرەوە لە بنەڕەتدا کۆجیتۆی دیکارتی و تێزی «من بیردەکەمەوە» دەکەوێتە قەیرانێکی ڕاستەقینەوە. چونکە ئەوەی بیردەکاتەوە من نییم، بەڵکو ئەوی دییە کە لە ناو زماندا نیشتەجێبووە، ئیدی لەم پێگەیەوە لاکان دەڵێت «من، ئەوی دییە». من بوونی نییە، سوبێکت بوونی نییە، سوبێکت شوێنی دەرکەوتنەوەی ئەوی دییە، چونکە لە جەوهەردا کەرەستەی خۆدەرخستنی من، کەرەستەی ئەویدییە. دیارە لاکان ناڵێت لەبەرئەوەی سوبێکت زمانی خۆی نییە بۆیە سوبێکت نییە، پرۆسەکە لای لاکان درێژتر و ئاڵۆزترە، سەرەتاکەشی لە «قۆناغی ئاوێنەوە» دەستپێدەکات. مرۆڤ کەمێک درەنگتر فێری زمان دەبێت و دەکەوێتە ناو تۆڕی ئامازە و ڕەمزە ئاڵۆزەکانییەوە. پێش فێربوونی زمان منداڵ لە نێوان شەش تا هەژدە مانگیدا بە قۆناغی گرنگ و سەرەکی ئاوێنەدا دەڕوات. وەک چۆن تێگەیشتن لە چەمکی «پرەنسیپی واقیع» سەرەتای تێگەیشتنە لە فرۆید، تێگەیشتن لە قۆناغی ئاوێنەش دروازەی تێگەیشتنە لە لاکان. گەر ورد ببینین سەرەتای سوبێکت لای لاکان بە پێچەوانەی دیکارتەوە لە بیرکردنەوەوە دەست پێناکات، بەڵکو لە بینینەوە دەستپێدەکات، بەجۆرێک دەتوانم بڵێم کۆجیتۆی دیکارتی لای لاکان هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێت بە «من دەبینم کەواتە هەم». قۆناغی ئاوێنە سەرەتای سەنترالیزەبوونی بینینە، بەڵام بینین هەر لەسەرەتاشەوە لای لاکان لەتکەر و دابەشکەری سوبێکتە. مرۆڤ لە ڕێگای بینین و ناسینەوە و جیاکردنەوەی خودی خۆیەوە لەوانی دی دەتوانێت خۆی وەک سوبێکتێک تەماشابکات. لەم قۆناغەدا منداڵ هێشتا کۆنترۆڵی تەواوەتی بەسەر لەشی خۆی و پارچەکانی جەستەی خۆیدا

نییە، هێشتا ناتوانێت لەشی وەک یەکەیەکی یەکگرتوو و پێکهاتێکی تەواو و تاکپارچە سەیربکات، واتە سیفەتی سەرەکی زارۆکی بچکۆلە لەم تەمەنەدا ئەوەیە جەستەیەکی نایەکانگیری هەیە، ئەو هەستەی تێدا دروست نەبووە کە ئەم دەستە دەستی خۆیەتی و ئەم قاچە قاچی خۆیەتی و ئەم جوڵەیە لەگەڵ جوڵەکانی دیکەی لەشیدا دەکرێت یەکبخرێت و پێکڕای پارچەکان و ئەندامەکان بەیەکەوە داڕێژەری یەکەیەکی تەواو و لێکنەترازاوبن، بەمانایەکی دی هێشتا ئەو هەستەی تێدا نەخولقاوە کە لەشی تەواو لە لەشی دایک جیابۆتەوە و سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە، هێشتا خۆی بەدرێژکراوەیەکی دایک دەزانێت. بەڵام منداڵ لەبەر ئاوێنەدا «هەڵبەت گەر ئاوێنەش نەبوو لە ڕێگای تەماهیکردنەوە لەگەڵ جەستەی یەکێکی دیدا» ئەو ئەزموونە دەژی کە یەکەمجار خۆی وەک یەکەیەکی تەواوەتی دەبینێت، بەپێی لاکان لە نێوان جەستەی ناکامڵ و ڕاستەقینەکەی زارۆک و جەستە کامڵ و یەکانگیر و وێنەیی ناو ئاوێنەکەدا پەیوەندییەک دروستدەبێت کە بزوێن و پێکهێنی سیستمی دەروونییە. لە نێوان وێنەی کامڵی ناو ئاوێنە و هەستی نوقسان و پارچەپەرچەی خۆیدا، منداڵ ئەو ئارەزووە گەورەدەکات کە ناکامڵی و پارچەپارچەیی خۆی بگەێنێتە ئاستی کامڵی و یەکانگیری وێنەی ناو ئاوێنەکە. چونکە لە بنەڕەتدا منداڵ هێشتا نەگەیشتۆتە ئەوەی بزانێت وێنە چییە، لەبەرئەوە نیگاری ناو ئاوێنەکەی لێدەبێتە یەکێکی دیکەی وەک خۆی، بەڵام بە کامڵی و یەکانگیریی. لێرەدا وێنەی ناو ئاوێنەکە دەبێتە وێنەیەکی نمونەیی - ئیدیال و یەکگرتن لەگەڵ چۆنایەتی ئەو وێنە ئیدیالەدا دەبێتە ئامانجی سیستمی دەروونی. ئیدی ئەوەی لەشی خۆی ناتوانێت پێشکەشیبکات، منداڵ لە ڕێگای گەیشتن بە لەشی ئیدیالی ناو ئاوێنەکەوە دەخوازێت بیگاتێ، ئەو هەلاهەلابوونەی لە هەستی ئەودا هەیە لە ڕێگای تەماهیکردنەوە لەگەڵ وێنەی ئاوێنەکەدا دەیەوێت تێیبپەڕێنێت. ئەم ئاستە لە گەشە

چەندە بۆ گەشەی منداڵ گرنگە هێندەش دەرەنجامی دراماتیکی هەیە، لێرەدا یەکەم دابەشبوونی گرنگ ڕوودەدات لە نێوان منی ڕاستەقینەی منداڵ و منی ئیدیالی ناو ئاوێنەکەدا. لاکان بەم ئەزموونە دەڵێت «ئەوە سەرکێشی سەرەکییە، کە مرۆڤ یەکەمجار بینینی خۆی ئەزموونەدەکات، خۆی وەک یەکێکی دی دەناسێت، ئەمە ڕەهەندێکی جەوهەری مرۆڤە کە بونیاد دەبەخشێتە تەواوی فەنتازیاکانی» «جاک لاکان، لەلای گێردا پاگل. ل٢٤». لێرەدا گەیشتن بە منی ئیدیال دەبێتە سەرچاوەی سەرەکی فەنتازیاکان، یەکەمین فەنتازیای گەورەی مرۆڤ حەزکردنێتی لە وێنەی خۆی لە ئاوێنەدا. ئاشکرایە ئەم چیرۆکەی لاکان چیرۆکێکی نوێ نییە، بەڵکو فۆرمێکی تازەی چیرۆکە ئۆڤیدییەکەیە دەربارەی «نەرسیس» و حەزکردنی لە وێنەی خۆی لە ئاوێنەی جۆگەکەدا. ئەزمونە نەرسیسییەکە ئەزمونی هەموومانە و حەزکردن لە وێنەی خود «یان وێنەی ئیدیالی خود» ئەزموونی سەرەتای هەموو مرۆڤایەتییە. بەڵام ئەم فەنتازیا و حەزە خاڵی نییە لە تراژیدیا، مرۆڤ تا لەمدیوی ئاوێنەکەیە ناگاتە وێنەی ئەودیوی ئاوێنەکە، بە مانایەکی تر وێنەی ئاوێنەکە دەبێتە ئەو ئیدیالە مەحاڵەی کە دەمانەوێت پێیبگەین و پێیناگەین، دەبێتە سەمبولی ئیدیالێک کە دواتر زەمینەی هەموو جۆرە تەماهیکردنێک لەگەڵ ئیدیالەکانی تردا پێکولدەکات. نەرسیس سەرەتای ئەو ململانێیە کە لە نێوان منی ڕاستەقینەی ناتەواو و منی نمونەیی ئیدیال و پێگەییودا دروستدەبێت. نەرسیس کە حەز لە خۆی دەکات لە ئاوێنەی جۆگەکەدا نازانێت ئەوە وێنەی خۆیەتی، واتە نەرسیس کە حەز لە نەرسیس دەکات، نازانێت کە حەزی لە نەرسیس کردوە، خۆی وەک یەکێکی دی خۆشدەوێت. ئەم دۆخە دەبێتە مایەی جیابوونەوەی نەرسیسی فرۆیدی لە نەرسیسی لاکانی، لای فرۆید نەرسیس حەز لە خۆی دەکات، بەڵام لای لاکان نەرسیس حەز لە وێنەیەک دەکات لەدەرەوەی خۆی، وێنەی ناو ئاوێنەکە لای لاکان

یەکێکی دییە، لەبەرئەوە نەرسیسی لاکانی لەسەر حەزکردن لە خود وەک یەکێکی دی دروستبووە. «بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە پ. ڤیدمەر. ل ٤٨ ــ ٥١»». سوبێکت لێرەدا خۆی وەک «ئارەزووکردن بۆ ئەوانی دی» دەناسێت، واتە خۆی هیچ نییە و دەیەوێت بۆشایی و کەمی و نوقسانی خۆی لە ڕێگای تەماهیکردن لەگەڵ وێنەیەکی دەرەکیدا دروستبکات. لەم ئاستەدا لاکان تێزەکەی هیگڵ دەربارەی «کۆیلە» و «ئاغا» دەهێنێتە ناو تەفسیری ئەو ساتە وەختە دەروونییەوە. لە دیالەکتێکی ئاغا و کۆیلەی هیگڵیدا مرۆڤ ئارەزووییەکی سەرەتایی و سەرەکی دەیجوڵێنێت کە «ئارەزووی دانپیانانە»، ئارەزووی ئەوەی کەسی بەرامبەر بیناسێت و وەک سەروەر دانی پێدابنێت، لای هیگڵیش مۆراڵی سوبێکت گرێدراوی ڕەفتارێتی لەو ململانێیەدا، بەپێی لۆژیکی هیگڵی دوو کەس لە جێگایەکدا یەکێکیان دەبێتە ئاغا و یەکێکی دییان دەبێتە سەروەر. ئەوەی دەبێتە ئاغا دەبێت دانپیانانی ئەویدیکە وەک ئاغا مسۆگەربکات، لێرەوە ئاغابوون بەوەوە گرێدراوە کە ئەویدی ئاغا وەک سەروەر و سالار بناسێنێت. لە هاوکێشە هیگڵییەکەدا ئەو کەسەی ناوێرێت ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە و هێزی ئەوەی نییە بچێتە ململانێکەوە دەبێتە کۆیلە و ئەوەی ڕیسک بە ژیانی خۆیەوە دەکات دەبێتە ئاغا. بەڵام وەک جەوهەر ئاغایەتی کەسی سەروەر هەمیشە بە دانپیانانی کەسی کۆیلەوە بەستراوە. لە سیستمی دەروونیشدا منی ئیدیال (moi، Ich) شوێنی ئاغا وەردەگرێت و جێگای منی ڕاستەقینە (je، Ich) دەگرێتەوە. منی ڕاستەقینە لە بەردەم هەستی پارچەپارچەبوونی خۆی و کەماڵی ئەویدیدا، وێنەی ناو ئاوێنەکە بەبراوە و خودی ڕاستەقینەی خۆی وەک دۆڕاو دەبینێت. بە کورتی منی ڕاستەقینە کە ئاماژەیە بۆ سوبێکتی ڕاستەقینە وەک کۆیلە دەکشێتە دواوە و منێکی تر کە سوبێکت خۆی نییە، وێنەیەکی دەرەکییە و تەماهی لەگەڵدا کردوە دەبێتە ئاغای ناو ماڵی سوبێکت، لێرەوە ڕستە بە ناوبانگەکەی لاکان سەرچاوە دەگرێت

کە دەڵێت «من یەکێکی دییە». واتە «من» بەرلەوەی فێری زمان بێت، بەرلەوەی پرۆسەی تەماهیکردن لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خۆیدا دەست پێبکات، تووشی شکستێکی گەورە بووە، کاتێک شەڕی خۆی لەگەڵ وێنەی ناو ئاوێنەکەدا دەدۆڕێنێت. «بڕوانە گێردا پاگل. ل ٢١ ـ٣٥» . بەڵام «منی ڕاستەقینە ــ je) Ich)» منی پارچەپارچە، منێک کە هەستی یەکەمی ئەوەیە کە یەکەیەکی نوقسان و لێکترازاوە لە ئەستدا، لە ژێرەوە دەمێنێتەوە، وەک پاڵهێزی خەونی ناخۆش، وەک خولقێنەری فەنتازیای تاریک کە لەش تێیدا پارچەپارچە یان گۆڕاو یان شێواو دەردەکەوێت «وەک لە دەعجانەکەی کافکا، یان لە نیگارەکانی هیرنیمۆس بۆش، یان لە لەشە شێواو و سڕدراوە و لوولکراوەکانی پێکۆندا دەیبینینەوە». بە کورتی سەرکەوتنی منی نمونەیی ئەوە ناگەیێنێت کە منێکی ڕاستەقینەی بریندار و چەپێنراو لە ژێرەوە نییە کە فەنتازیاکانی خۆیمان بۆ دەگوازێتەوە. لێرەوە وێنەی لەشی زامدار یان «گەڕانەوەی وێنەی لەشی هەلاهەلا» بەشێکی گرنگی فەنتازیا و خەون و خەیاڵ و مۆتەکەکانی مرۆڤە. ئەمە لە خەونەکانیشمانەوە دەگوازرێتەوە بۆ ناو چیرۆک و سینەما و تابلۆ و زانستەکان « بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کای هامەرمایستەر. ل٤٦ ــ٤٧». ئەم تێزەیە کە منی ڕاستەقینە دەچەپێنرێت و وەک نەست کاردەکات، سوبێکتیش وەک ئەوەی ئێمە دەیبینین و دەیناسین سوبێکتێکی خەیاڵییە کە هیچی لەو سوبێکتە عاقڵە بەرپرسە ناچێت کە ڕۆشنگەریی خۆرئاوا لای کەسانی وەک کانت و مارکس و سارتەر وێنایانکردوە، دوو تێزی لاکانی گرنگن، هەر بۆیە لاکان بەردەوام بە «مراندنی مرۆڤ» و «کوشتنی سوبێکت» تومەتباردەکرێت. کە منی ڕاستەقینە Ich(je) بچەپێنرێت واتە تەنیا وەک نەست دەتوانێت کاربکات، هەرکاتێکیش هاتەقسە وەک «ئەو Es » ـی فرۆیدی قسەدەکات. منی ڕاستەقینە لە ڕاستیدا هەرگیز لەسەر شانۆکە دەرناکەوێت، بەڵکو

تەنیا لە ڕێگای ونبوونییەوە هەستی پێدەکەین، تاکە پەیوەندیش لە نێوان منی ڕاستەقینەمان و ئێمەدا ئەو نامە پڕ شفرە و سەمبولانەیە کە لە شوێنێکی نادیارەوە دێن کە ناومان ناوە نەست. لاکان لەم خاڵەدا لەگەڵ فرۆیدا تەبایە و هەر وەک ئەو نەست بە دەڤەری ڕاستەقینەی سوبێکت دەزانێت، بەڵام سەبارەت بە چۆنێتی تێگەیشتنی لە ستراکتور و ناوەڕۆکی نەست لە فرۆید جیادەبێتەوە. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر چیرۆکی منداڵ و ئاوێنەکە زۆر شتمان بۆ ڕووندەبێتەوە. منداڵ لەو ساتەدا کە بۆ خودی خۆی دەگەڕێت، خۆی وندەکات، بەمجۆرەش پرۆسەی خودسازی لای لاکان بە خودنامۆبیدا دەڕوات، واتە سەرەتای هەوڵی خودناسین گرێدراوی خۆونکردنە. لە یەکەم ساتەوە منداڵ دەیەوێت وەک وێنەی یەکانگیر و یەک پارچەی ناو ئاوێنەکەی لێبێت، لە یەکەم ساتەوە تەماهیکردن لەگەڵ ئیدیالێکی دەرەکیدا وادەکات منی ڕاستەقینەی خۆی بە شتێکی دی داپۆشێت و بە قەڵغانێکی دەرەکی ئابلۆقەی بدات، لێرەوە نامۆبوونێکی بەردەوام دروستدەبێت و پرۆسەی خۆدروستکردن بە خۆنامۆکردنەوە دەبەسترێتەوە. لای لاکان ئەم بازنەیە هەرگیز داناخرێت، واتە سوبێکت چیدی ئەو شتە نییە کە هەمانە، بەڵکو ئەوەیە کە بۆی دەگەڕێین، ئەوە نییە کە لە ڕابوردوودا بونیادمان ناوە، ئەوەیە کە دەمانەوێت لە پاشەڕۆژدا پێیبگەین. بە تەفسیرێکی دی، سوبێکت ئەو شتەیە کە هەمیشە دەکەوێتە پێشمانەوە نەوەک دوامانەوە. بەپێی ئەزموونی ئاوێنەکە ڕەمزی کەماڵ هەرگیز من نیم، بەڵکو ئەوی دییە، کەسێکە لەدەرەوەی من، دوور لە من، واتە من نوقسانییەکی هەمیشەییم. بە مانایەک لە ماناکان سوبێکت ئەو چاڵە هەمیشەییەی ناوەڕاستی وجودمانە کە دەمانەوێت پڕیبکەینەوە، ئەو بۆشاییە هەمیشەییەیە کە لە ناوماندایە، ئەو ئەگەرە ئیدیالەیە کە لە هەوڵی وەدەستخستنیداین. سوبێکت هەمیشە ئەو شتەیە کە لە پاشەڕۆژدا دەیگەینێ. «پاگڵ. ل٣٧»

واتە خاڵێکی بەرقەراربوون بوونی نییە مرۆڤ تێیدا بڵێت «ئەمە منم» «ئەمە سوبێکتی کامڵ و ئیدیالی منە»، هەمیشە درزێک دەمێنێتەوە کە پڕ نابێتەوە، ئەو درزە مرۆڤ دەبێت بە خەیاڵ پڕیبکاتەوە، ئەو منەی مرۆڤ بەڕاستی بۆی ناگیرێت لە ئاستی خەیاڵدا دەیگرێت، بۆیە لای لاکان وشەی «فەنتازما» ڕۆڵێکی گرنگ لە پێکهاتی «من» دا دەبینێت. بەڵام جگە لەم نامۆبوونە سەرەتاییە کە دەکەوێتە قۆناغی پێش قسەکردنی منداڵەوە، نامۆبوونێکی دیکە چاوەڕواناندەکات کە خودی زمانە. لاکان بە پێچەوانەی فرۆیدەوە «کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێک دەبینێت کە غەریزە بایۆلۆژییەکان دەیجوڵێنێت» وادەبینێت مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە کە گیرۆدەی سیستمی ڕەمزی زمانە. لاکان بە گەڕانەوە بۆ زماناسی سۆسێر هەوڵدەدات ئەوە ڕوونبکاتەوە کە نەست وەک زمان خولقاوە، ئەمە تەنیا مانای ئەوە نییە کە «نەستی نارێک و پڕ ئاژاوەی فرۆیدی» وەردەگەڕێتە سەر «نەستێکی ئەندازەیی ژێر» کە بەیاسا و ڕێزمانی زمان ئیشدەکات، بەڵکو دەستکاری خودی تێڕوانینیشمان بۆ زمان دەکات. بۆ نمونە لە دیدی سۆسێرەوە مەدلول «مانا ـ Signifikat» پێش دال «ئامـاژە ـ Signifikant» دەکەوێت، لاکان ئەم هاوکێشەیە پێچەوانە دەکاتەوە. مانا شتێکە دواتر دەخولقێت، ئەوەی لە زماندا سەرەکییە زنجیرەی ئامـاژەکانە. ئەوەی زمان دروستدەکات جیاوازی ئامـاژەیەکە «دالێکە» لە گەڵ ئەوانی دیدا، مانا لە ئامـاژە خۆیەوە هەڵناقوڵێت، بەڵکو هەموو ئامـاژەیەک لە ناو زنجیرەیەکی ئامـاژەدا جێگیردەبێت، یاخود دروستتر لە ناو کۆمەڵێک زنجیرە ئامـاژەدا جێگیردەبێت. مانا ئەو پنتەگرێیە دیاریدەکات کە تێیدا وشە لە ناو زنجیرە زمانەوانییەکەدا داگیریدەکات، هیچ وشەیەکیش لەدەرەوەی ناوکۆیی «سیاق» مانای نییە. ئەمە لە جەوهەردا گۆڕانکارییەکی قووڵ لە تێگەیشتنماندا دروستدەکات، هەندێک بە هۆی ئەم بۆچوونەوە لاکان نەوەک بە ستراکچەرالیست

«بونیادگەر» بەڵکو وەک «پۆست ستراکچەڕالیست» و «پۆست مۆدێرن» تەماشادەکەن «بڕوانە وتارەکەی هانز هیبل لە لای کلاوس میشائیل بۆگدال . ل٥٩»، چونکە بەپێی ئەم بۆچوونە وشە و مانا بەیەکەوە یەکەیەکی داخراو دروست ناکەن، وشە بەسەر بێشومار ئەگەری مانادا دەکرێتەوە و گەیشتن بە مانایەک بۆ وشە دەبێتە کارێکی نەکردە، واتە لە ناو هەموو وشەیەکدا ئەگەرێکی دیکەی مانا هەیە کە جێگای وشە لە زنجیرەیەکی نوێی ڕێکخستندا دیاریدەکات، بە مانایەکی تر مانای ڕاستەقینە بوونی نییە، مانا هیچ نییە جگە لە ئاماژە بۆ بۆشاییەک، بۆ شەبەقێکی قووڵ کە لە هەناوی وشەدا خەوتووە، بۆ ئیدیالێک کە وشە هەرگیزاو هەرگیز پێیناگات، شەبەقێکە هەرجارە و واتایەک پڕیدەکاتەوە. مانا واتای جێگیربوونی پەیوەندی لە نێوان دال و مەدلولدا، بەڵام ئەم جێگیرییە مەحاڵە، چونکە شێوەی ڕیزبەندی ئاماژەکان «دالەکان» ناکۆتایە، کە ئەو ڕیزبەندییەش ناکۆتابوو، واتا هیچ واتایەک ئاماژە نییە بۆ دواهەمین مانا، یاخود وەک لاکان خۆی دەڵێت «مانا بەردەوام دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ئامازەوە» «لاکان. ل٢٧». زمان بەسەرێک وادەکات سەرکەوتنی «منی ئیدیال» سەرکەوتنێکی تەواو نەبێت، چونکە منی ڕاستەقینە بە کۆمەکی زمان دەتوانێت بگەڕێتەوە، بەڵام بەدیوێکی دیدا، بەوەدا نەست زمانە، کەواتە شوێنی گووتاری ئەوی دییە، ئەوی دی لە ڕێگای زمانەوە دەمانباتە ناو دونیای خۆی، دەمانباتە ناو سیستمێکی ڕەمزی کە تێیدا پەیوەندییە ڕەمزییەکان باڵادەستن. لە قۆناغی یەکەمدا مرۆڤ لە ڕێگای خەیاڵەوە هەوڵدەدات نوقسانی و بۆشایی ناو سوبێکت پڕبکاتەوە، بەوەی تەماهی لەگەڵ منی خەیاڵی ناو ئاوێنەکەدا دەکات، لە قۆناغی دووەمدا لە ڕێگای زمانەوە هەوڵدەدات ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە. بەڵام لاکان بە زمان و زاراوەی خۆی چۆن تەعبیر لەم هاوکێشەیە دەکات؟. لای لاکان من سەرەتا بە a ئەلفی بچوک ئاماژەی بۆ دەکرێت، وێنەی

ئاوێنەکەش بە a . بە لێکدانی ئەم دووانە و کۆکردنەوەیان لە یەک یەکەدا « a ـ a »، «منی ئیدیال moi، Ich» دروستدەبێت، ئەو منەی کە مرۆڤ دەیەوێت پێیبگات، ئەو وێنەیەی سەرچاوەی هەموو تەماهییەکانی ژیانە، بەڵام ئەو خۆزگە نهێنییە بۆ توانەوە و یەکگرتنەوە لەگەڵ ئیدیالدا بە ئاقاری یەکگرتنەوەی خەیاڵیدا دەڕوات، خەیاڵ پردی پەیوەندی نێوان هەردوو ئەلفەکەیە. بەڵام منداڵ تەنیا لەگەڵ وێنەی ئاوێنەیی خۆیدا تەماهی ناکات. منداڵ لەگەڵ دایک و باوکدا دەژی، گەورەکان شاهیدی هەموو شتێکی ئەون، دەنگی ئەوان، دەرکەوتن و ونبوونیان لە دارشتنی ستراکتوری سوبێکتدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. واتە جگە لە ئەویدی چکۆلانە a «ئەوی ناو ئاوێنەکە» کە دەبێت بە یەکەم مەتریالی تەماهیکردن، ئەوێکی دی ڕاستەقینە و گەورە هەیە کە لاکان بە «ئەویدی گەورە ـ A» ناویدەبات، کە دایک یان بابە. ئەویدی گەورە «Der gro e andere» نوێنەری سیستمی سەمبولی زمان و فەرمانەکانێتی، دایک و باب لە ڕێگای دەنگەوە منداڵ دەبەنە ناو جیهانێکی ڕەمزییەوە کە تێیدا هەر دەنگە و ئاماژە بۆ شتێک دەکات، لای لاکان سنوورەکانی نێوان «ئەویدی گەورە» و «زمان» تەواو تێکەڵدەبن، بەجۆرێک دەکرێت بڵێین ئەویدی گەورە هەر زمان خۆیەتی. لێرەدا ڕاستییەکی گرنگی دیکەمان لای لاکان بۆ ڕووندەبێتەوە کە دەرکەوتنی ئەویدی بە خۆی و سیستمە ڕەمزییەکەیەوە، بە خۆی و زنجیرە ئاماژەکانییەوە دەبێتە زەمینەی خولقاندنی نەست، نەست بریتییە لە جێگای ئاماژەکان. ئەوەی نەست دەهێنێتە قسە ئەویدی گەورەیە. گەر ئەویدی نەبێت، زمان نییە کە زمانیش نەبوو سوبێکت نایەتەقسە، کە سوبێکتیش نەهاتەقسە واتە نەست نەهاتۆتەقسە. «سوبێکت S » تەنیا لە ڕێگای ئەویدی و پەیوەندیکردن بەوی دییەوە دەخولقێت، سروشتی ئەم پەیوەندییەش، سروشتێکی ڕەمزییە. «پاگل، ل ٥١ـ ٥٢». لەمەش گرنگتر

ئەوەیە کە بەپێی ئەم تێڕوانینە پێناسەی نەست دەبێتە پێناسەیەکی زمانەوانی، وەک «فرانسۆز دۆسە» دەڵێت «نەست چیدی ئەشکەوتێکی نهێنی نییە، کە دەبێت لەناویدا بگەڕێین و پشکنین سازبکەین، بەڵکو ئیدی دەکەوێتە سەر ڕوکاری وشەکان و ناو هەڵەکانی زمانەوە» «دۆسە. ل.١٨٦». نەست ئیدی شتێک نییە کە بتوانین دەرەوەی زمانی بۆ بگەڕێین.

لێرەدا دەبێت پرسیارێکی گرنگ بکەین، کە وەڵامەکەی بۆ تەواوی باسەکەمان زۆر گرنگە: ئاخۆ سوبێکت لە ناو سیستمی ڕەمزییدا دەتوێتەوە؟. ئەمە ئەو خاڵەیە کە بە ڕای سلافۆ ژیژیک، لاکان لە بونیادگەر ـ ستراکچەرالیستەکانی دی جیادەکاتەوە. لای بونیادگەرەکانی دی، سوبێکت تەواو لە ژێر ڕەحمەتی زماندایە، ئەو شتەیە کە زمان ڕێگای پێدەدات ببێت، گیرۆدەی سیستمێکی داخراوە، سنووری بیرکردنەوەی بەو سنوورانەوە گرێدراوە کە زمان دەرفەتی پێدەدات. واتە سوبێکت بە تەواوی بوونییەوە کۆیلەی بونیادێکی ڕەمزی و زمانەوانییە کە هەموو نۆرمە کولتووری و دینی و ئەخلاقی و ئاسۆکانی جیهانبینی تیادەچێنێت و بۆی دەستنیشاندەکات. بە کورتی ئێمە دیلێکی ئەبەدی بونیادین و دەربازێک نییە لە بونیاد بمانپارێزێت. بە ڕای ژیژیک، لاکان ناکەوێتە ناو ئەم مۆدێلە جەبرییەوە، لاکان ڕووبەرێکی گرنگ جێدەهێڵێت کە سیستمی ڕەمزی و خەیاڵی دەستیان پێیداناگات، شوێنێک دەکەوێتە دەرەوەی هەموو وەسف و ناونانێکەوە، جێگایەک زمان دەرەقەتی نایەت، ناتوانێت تەواو کۆنترۆڵیبکات، ئەویش ئەو ڕووبەرەیە کە بە «ڕیال» ناویدەبات. لێرەدا هەر وشەی ڕیال بەکاردەهێنمەوە، چونکە وەرگێڕانی ئەم وشەیە وەک هاوواتای «واقیع» هەڵەیەکی گەورەیە. بۆئەوەی لە ڕیال تێبگەین دەبێت نەیبەستینەوە بە واقیعەوە، ڕیال تەواو بە پێچەوانەوە، ئەو شتەیە کە نابێتە واقیع، بەچەشنێک من وەرگێڕانی هەندێ لە نوسەرانی عەرەب بۆ

ڕیال بە واقیع یان واقیعی، بەجۆرە وەرگێڕانێکی حەرفی و هەڵە دەزانم کە خزمەتی گەیاندنی ناوەڕۆکی تێرمەکە ناکات.

بەرلەوەی قسەیەکی تەواو لەسەر میکانیزمی ئیشکردنی خەیاڵی و ڕەمزی و ڕیال بکەین، دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ لای پەیوەندی سوبێکتی لاکانی لەگەڵ کۆجیتۆی دیکارتیدا. بەڕای ژیژیک هەڵەیەکی گەورەیە واتێبگەین کە کۆجیتۆی دیکارتی ڕۆڵی دژ و پێچەوانەی سوبێکتی لاکانییە، ئەو ڕای وایە سوبێکت لای لاکان مۆدێلێکی دیکەی کۆجیتۆی دیکارتییە. ئەو دەڵێت کوجیتۆی دیکارتیش جێگایەکی خاڵییە، ئەو پنتەیە کە هیچ شتێکی تێدا نییە، بەتاڵییەکە کە دوور و نزیک پەیوەندی بە مرۆڤ و بوونەوەری زیندووەوە نییە. دیکارت گومان لە هەموو بیرکردنەوەیەک دەکات، بۆ ئەوەی بگاتە پنتێکی بیرکردنەوە کە خاڵییە لە هەموو شتێک، واتە بیرکردنەوەیەک بەبێ ناوەڕۆک، بیرکردنەوە وەک بیرکردنەوە بەبێ بابەتی بیرکردنەوە. بە کورتی کۆجیتۆ وەک سوبێکتی لاکانی تەنیا گریمانەیەکی لۆژیکییە، وەک چۆن سوبێکتی لاکانیش فۆرمێکی پەتییە بەبێ ناوەڕۆک «هـ. کانگ کیم. ل ١٤. هەروەها ل ٢٠ ». بۆیە بە پێی بۆچوونی ژیژیک ئەنتی هیومانیزم لە دیکارتەوە دەستپێدەکات، ئەوە دیکارتە مرۆڤ کورتدەکاتەوە بۆسەر پنتێکی خاڵی و بۆشاییەکی گەورە. دیکارت و لاکانیش لە فۆرمێکی بەتاڵەوە دەست پێدەکەن، دیارە دواتر بە توندی لەیەک جیادەبنەوە، سوبێکتی لاکانی لە وێستگەی دواتریشدا کە بیردەکاتەوە، هێشتا بیرکردنەوەی بەرهەمی خۆی نییە، بەڵام دیکارت بە وێنەی مرۆڤێکی هوشیارەوە دەگیرسێتەوە. لای دیکارت «من» و «سوبێکت» یەک شتن، من واتە سوبێکتێکی هوشیار، بەڵام جەوهەری دیدی لاکان لەسەر جیاکردنەوەی «من» و «سوبێکت» دروستبووە. سوبێکت لای لاکان پرۆژە بەردەوامەکانی گەیشتنە بە من، منێک کە هەرگیز فۆرمی کۆتایی وەرناگرێت، منێک کە هەمیشە لەدەرەوەی

وەدیهاتنی ڕەهاوە دەوەستێت. بە چەشنێک لاکان پێیوایە هەموو ناسینێکی «من» جۆرێکە لە هەڵەکردن و هەڵەناسین «Verkennung». ئەمجۆرە هەمەڕەنگییە لە «من» دا، ئەم فرە نیگار و فرە وێنەییەی لە مندا هەیە، سەرەتاکانی لای فرۆیدیش دەرکەوتووە، بەڵام فرۆید ئەو دەرەنجامگیرییە قووڵ و فەلسەفییەی لێ ناگرێت کە لای لاکان دەیبینین. بۆ نمونە فرۆید لە کتێبی تەفسیری خەونەکاندا تەواو سەرەنجی ئەو فرە ڕەنگییەی «من» دەدات و دەنوسێت «گەر لە ناوەڕۆکی خەوندا لەبری من کەسێکی نامۆ و نەناس دەرکەوت، ئەوکات دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە خودی خۆم بە هۆی تەماهیکردنەوە خزاوەتە پشت ئەو کەسە نامۆ و نەناسەوە، کەواتە من دەتوانم لە خەوندا «منی خۆم» بەشێوەی جۆراوجۆر بخەمەڕوو، هەندێک جار بەجۆرێکی ڕاستەوخۆ و هەندێک جاری دیش بە کۆمەکی تەماهیکردن لەگەڵ کەسێکی نامۆدا» « لە پ. ڤیدمەر. ل٤١ ـەوە وەرگیراوە». لاکان ئەم پرۆسەیە تەنیا لە خەودا قەتیس ناکات، بەڵکو لە تەواوی دروستبوونی مرۆڤدا دەیبینێتەوە.

لای لاکان سوبێکت دەروازەیەکی ڕاستەوخۆی بەرەو خۆی نییە، واتە خۆی لە ڕێگای خۆیەوە ناگاتە خۆی، مەحکومە بە نامۆبوونێکی هەمیشەیی. سوبێکت لە تێڕوانینی ئەودا سێ جار دوو کەرت و نامۆدەبێت، جارێکیان لەسەر ئاستی خەیاڵیدا کە بە کۆمەکی خەیاڵ تەماهی لەگەڵ یەکێکی تردا دەکات، جاری دووەمیش لەسەر ئاستی ڕەمزی، کاتێک زمانی یەکێکی دی بەکاردەهێنێت، سێهەم جاریش کاتێک جەستەی ڕاستەقینەی خۆی لە ئاستی «ڕیال» دا دەچێتە جێگایەک کە دەستی پێدا ناگات.

بۆئەوەی کەمێک ڕوونتر لە لاکان تێبگەین، دەبێت بە کورتی لەسەر هەردوو پرۆسەی خەیالی و ڕەمزی و ڕۆڵیان لە بونیادی سوبێکتدا قسەبکەم، چونکە بەبێ ڕوونکردنەوەی ئەم زاراوانە تێگەیشتن لە لاکان مەحاڵە.

# خەیاڵی چییە؟

گەر لە لاکانەوە بڕوانین خەیاڵ یەکەمین کرداری ڕاستەقینەی مرۆڤە، مرۆڤ سەرەتای سەرەتا بوونەوەرێکی عەقلانی و واقیعی نییە، بەڵکو مەخلوقێکە خەیاڵ دروستیدەکات. یەکەمین پەیوەندی مرۆڤ بە وێنەکەی خۆیەوە دەرگای دونیایەکی خەیاڵی لێدەخاتە سەرپشت. خەیاڵ دەرگای تەماهیکردنە، یەکانگیری شوناسیش لەگەڵ ئەویدیدا بەبێ خەیاڵ کاری نەکردەیە. یەکەمین ڕاستی گەورەی ژیانی مرۆڤ ئەوەیە کە لەسەرەتاوە خەیاڵ پێش ڕاستی دەکەوێت و خەیاڵ ئەو شتە دروستدەکات کە ناوی ڕاستییە. خەیاڵی لای لاکان شتێکە لە سیفاتیدا لە چەمکی «من» ی فرۆیدییەوە نزیکە، بە پێچەوانەی سەمبولییەوە کە لە «بەرزە من» و ڕیالەوە کە لە «ئەو»ی فرۆیدییەوە نزیکن. «کای هامەرمایستەر. ل ٤١». جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان لاکان و تێزە فەلسەفییەکانی دیکەدا بۆ خەیاڵ ئەوەیە، لاکان خەیاڵ وەک هەڵە و وەهمێک نیگادەکات کە بنەمای وجودی لەسەر بەندە. خەیاڵ لای لاکان هۆکاری هەڵەیەکی گەورەیە کە بوونی سوبێکتی لەسەر بونیادنراوە «هەڵەی گۆڕینی وێنەی ناو ئاوێنەکە بۆ ئیدیالی من»، بەبێ ئەو هەڵەیەش گەشەی سوبێکت نامومکینە. مرۆڤ لە قۆناغی ئاوێنەدا لە ڕێگای خەیالەوە تەماهی لەگەڵ نیگاری ناو ئاوێنەکەدا دەکات و وەک «منی نمونەیی» دەیخاتە سەر عەرشی ئومێدەکانی خۆی. خەیاڵ بەرهەمی ئەو ساتەیە کە تێیدا مرۆڤ وێنەی خۆی دەبینێت، ئەم خەیاڵە دوو ڕەهەندی هەیە کە یەکێکیان زاڵ دەبێت، ڕەهەندێکی پۆزەتیڤ و ڕەهەندێکی نەگەتیڤ. مرۆڤ وێنەکەی خۆی لە ئاوێنەدا دەبینێت و تووشی ئەو دۆخە دەبێت کە یاخود وێنەی خۆی قەبووڵدەکات یان وێنەکەی خۆی ڕەتدەکاتەوە و بۆ وێنەیەکی دی دەگەڕێت کە نایگاتێ

«دیسیرا لاوبنشتاین . ل١٢٧». خەیاڵ لە لەدایکبوونی سوبێکتدا پردێکی پەیوەندییە لەگەڵ «کۆنە نیگاری» مرۆڤ خۆیدا «دیسیرا لاوبنشتاین. ل١٢٨». وەک گووتم لاکان منی ناو ئاوێنەکە بە «ئەلفی بچوک Klein a » یاخود «بابەتی ئەلفی بچوک» ناودەبات. ئەلفی بچوک ئەویدییە، بەڵام ئەوێکە ئێمە بۆمان ناگیرێت و پێیناگەین، لەبەرئەوە پەیوەندییەکەمان لەگەڵیدا پەیوەندییەکی خەیاڵییە، هەرجارەی بابەتێک شوێنی ئەو بابەتە پڕدەکاتەوە. سەرەتا دایک ئەو شوێنە داگیردەکات. ئەلفی بچوک ئەو بابەتی خواست و ئارەزووەیە کە بەهۆی هەستکردنەوە بە نوقسانی سوبێکت دەمانەوێت و دەخوازین ئەو درزی کەموکەرتییەی پێپڕبکەینەوە. «خەیاڵ» بزوێنی خەون و فەنتازیا و ترس و تەماهیکردنەکانمانە لە پێناوی گرتن و گەیشتن بەو بابەتی خواست و ویستە ونەدا کە ئەلفی بچوکە. مرۆڤ لە ڕێگای خەیاڵەوە بەدوای سوبێکتی ون یان مەحاڵی خۆیدا دەگەڕێت. خەیاڵ لە زمان و وێنەدا تەعبیری خۆی دەدۆزێتەوە و دەتوانێت وەک حەقیقەت دەربکەوێت. لە سیستمی دەرونیدا مرۆڤ بە زەحمەت خەیاڵ وەک خەیاڵ دەناسێنێت، بەپێچەوانەوە خەیاڵ هەمیشە لە بەخشینی شوناسی سەرەتاییدا بە سوبێکت ڕێکخەر و دروستکەرێکی گرنگە کە سوبێکت ناتوانێت خۆی لێدەربازبکات... بەواتایەکی تر هەر یەکێک لە ئێمە دەستکردنی پرۆسەیەکی خەیاڵین، پرۆسەیەک لە قۆناغی ئاوێنەوە دەست پێدەکات و دواتریش دەستمان لێهەڵناگرێت و دەربازمان لێی نییە.

## ڕەمزی چییە؟

پێتەر ڤیدمەر دەڵێت «یەکەمین شتێک مرۆڤ لە ژیانیدا تووشی دەبێت، ئامارەکانن». مرۆڤ بەرلەوەی فێری تێگەیشتنی مانا بێت، بەرلەوەی عەقڵی بە ئەندازەیەک کامڵ بووبێت بتوانێت واتاکان جیابکاتەوە، لە

کۆمەڵێک نیشانە تێدەگات و دەتوانێت ئامازەکانی دڵنیایی و تورەیی و خۆشی لە سیمای ئەوانی دیدا بخوێنێتەوە. واتە بەرلەوەی لە مانا تێبگات لە رەمز تێدەگات، بەرلەوەی لە واتا بزانێت، لە جیهانێکدا دەژی کە پڕە لە ئامازە و شفرە و کۆد. بەڵام دەبێت یەکێک هەبێت کە دەستی منداڵ بەرەو جەنگەڵی ئەو هەموو مانا و ئامازەیە بگرێت و فێریبکات لە ماناکانیان تێبگات و بتوانێت لەگەڵیاندا هەڵبکات و بەکاریانبهێنێت.

گەورەترین پەیوەندی منداڵ سەرەتا بە دایک و باوکییەوەیەتی، دایک و باوک بە کۆمەکی زمان منداڵ دەبەنە ناو سیستمەوە. بەجۆرێک هەتا تەماهیکردن و وەگەرخستنی پرۆسێسی خەیاڵی لای لاکان بەبێ بوونی سیستمی رەمزی دووردەست و نەکار دەردەکەوێت. منداڵ کە لە بەر ئاوێنەدا دەوەستێت، زۆربەی کات لە ئامێزی دایکیایەتی. سەرەتا ناسینەوەی دایک لە ئاوێنەکەدا کۆمەکی پێدەکات وێنەی خۆشی بناسێتەوە، بەڵام بۆئەوەی کە دڵنیابێت ئەویدی لە ئاوێنەکەدا وێنەی کامڵی خۆیەتی، وێنەی یەکگرتوو و یەکپارچەی خۆیەتی، پێویستی بە سەلماندنی یەکێکی دەرەکی هەیە، ئەوەی ئەو رۆڵە دەبینێت نیگای سەلمێنەری دایک و ئامازەکانی ئەو و سەلماندنە زمانەوانییەکەیەتی، دایک ئەوە بۆ منداڵ دەسەلمێنێت کە نیگاری ناو ئاوێنەکە، نیگاری ئەوە. هەر لەوێشەوە پەیوەندییەکی خەیاڵی لە نێوان منی راستەقینە «ئەلف» و وێنەی من «ئەلفی بچوک» دا بە کۆمەک و یاریدەی ئەو دەسەڵاتە رەمزییە دروستدەبێت کە دایک «یان ئەویدی گەورە» نوێنەرایەتیدەکات. بەپێی لاکان تەوەری ]ئەلف«a» ـ ئەلفی بچوک « a» [. تەوەری ئیشکردنی خەیاڵە، تەوەری پەیوەندی من و منە، تەوەری نامۆبوونی سەرەتایی سوبێکتە لە خۆی، ساتی ناسینی خودە وەک بێگانە، لێرەدا a منی راستەقینەی منداڵ و a منی ئیدیالی ناو ئاوێنەکەیە. بەڵام ئەم

تـەوەرە تەنیـا بـە کۆمەکـی ئـەوی گـەورە و بە سـەلماندنی ئـەو دەکەوێتەگەڕ، لێرەدا سـوبێکت لـە ڕێـگای زمانـی ئـەوی دییـەوە، لـە ڕێـگای ئەویـدی گـەورە «A» وە دێتەقسـە، تـەوەری نێـوان سـوبێکت و ئەویـدی گـەورە تـەوەری ڕەمزییـە، تـەوەری پەیوەنـدی مـن و نامنـە، ئـەو نامنـەی تەنیـا لـە ڕێـگای ئەوەوە «لـە ڕێـگای زمانـی ئـەوەوە هەیـە و بوونـی دەبێـت». لێرەوە لاکان بەرابـەر سێگۆشـە فرۆیدییـە بـە ناوبانگەکـەی «مـن ــ بەرزەمـن ــ ئـەو» ئەم هێڵکارییـە نوێیـە دەخاتـە بەردەسـت کـە تەعبیـر لەدروسـتبوون و تێکترازانـی کرداری ڕەمـزی و خەیاڵـی لـە سیسـتمی دەرونیـدا دەکات «هێڵکارییەکـەم لە گێـردا پـاکڵ. ل ٥١ بـە هەندێـک دەسـتکاری و ڕاڤـەی زیاتـرەوە وەرگرتـووە»

تەوەری ئەلف ـ ئەلفی بچوک: تەوەری خەیاڵی

تەوەری سوبێکت ـ ئەویدی گەورە: تەوەری ڕەمزی یان تەوەری ئەست




لـە قۆناغـی یەکەمـدا، تـەوەری ئەلـف ــ ئەلفـی بچـوک و بەپێـی ئیشـکردنی خەیـاڵ وێنـە ڕۆڵـی سـەنتراڵ لـە دروسـتکردنی کاراکتـەردا دەبینێـت، لـە قۆناغـی دووەمـدا، تـەوەری سـوبێکت ــ ئـەوی گـەورە و بەپێـی هاتنـە نـاوەوەی سیسـتمی ڕەمـزی، زمـان ڕۆڵـی سـەنتراڵ لـە دروسـتکردنی سـوبێکتدا دەگێڕێـت.

لای لاکان سیسـتمی ڕەمـزی ئـەو سیسـتمەیە کـە مـرۆڤ دەباتـە نـاو جیهانـەوە و وادەکات تێبـگات و بتوانێـت تەعبیـر لـە خۆیبـکات. واتـە بـەر

لەهەر شتێک سیستمی زمانە کە بەبێ ئەو سوبێکت نایەتە قسە و ناتوانێت هیچ لەسەر خۆی بڵێت، هەروەها سیستمی ئەمرو نەهییەکانی باوکیشە، چەمکی «بەناوی باوکەوە» لای لاکان ڕۆلێکی گرنگ دەبینێت، باوک لای لاکان هێمای فەرمان و یاساکانی کۆمەڵە، بەڵام دیارە باوک ئامارژە نییە بۆ باوکی بایۆلۆژی بەڵکو ئامارژەیە بۆ جێگایەکی ڕەمزی کە هەر هێز و مەرجەعێک ئەو ڕۆلە ببینێت دەتوانێت پڕیبکاتەوە. چەمکی «ئەویدی گەورە» ش لای لاکان هەمان شێوە، نوێنەری دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانە، لەدەسەڵاتی باوکەوە تا دەسەڵاتە ئایدۆلۆژی و دینی و دەوڵەتییەکان. باوک ڕۆڵێکی گەورە لە سیستمی ڕەمزیدا دەبینێت، ئەوە مرۆڤ فێری مانای یاسا دەکات، فێری ترسی خەساندن و مانای حەرام و قەبووڵکردنی قەدەغەی دەکات. ئەوی گەورە لای لاکان تەنیا سەمبول نییە بەڵکو ئەو شاسەمبولەشە کە وادەکات تەواوی سیستمی ڕەمزی بکەوێتە ئیش، بۆنمونە بەبێ کەوتنەکاری «ئەویدی گەورە» ناکرێت پێشبینی خودا یان پاشا یان سەرۆک بکەین. ئەویدی گەورە ئەو چوارچێوە سەمبولییە دروستدەکات کە مرۆڤ دەخاتە ناو سیستم و وادەکات لە ئامێزی سیستمدا ونببێت و هەر ئەو شتانەش بیربکاتەوە کە سیستم پێیدەبەخشێت. هەڵبەت دارشتن و ستراکتوری ڕەمزی لای لاکان زۆر گرێدراوی تەفسیرکردنێتی بۆ پەیوەندی منداڵ و دایک و ڕۆڵی «فالۆسی ون» لەو پەیوەندییەدا، بەڵام ئەم تەوەرە بەرەو وردەکارییەکی وەهامان دەبات کە لە پرسیاری سەرەکی بابەتەکە زۆر دوورماندەخاتەوە. سیستمی ڕەمزی و خەیاڵی ناتوانن هەموو شتێک لە خۆبگرن، ئەمە تراژیدیا ناوەکی و خەوشە ئەبەدییەکەیانە. نە خەیاڵ، نە زمان ئەو هێزە گەورەیەیان نییە درزێکی گەورە بەبێ ناونان و بێ هێماکردن و وێناکردن جێنەهێڵن، لێرەوە بازنەی سێهەم کە بازنەی ئەو بەشە ناونەنراو و بەجێماوەیە بە ڕیال ناودەبرێت.

## ڕیال چییە؟

ڕیال «Das Real» «تۆماری سێهەمی سوبێکت» ڕۆڵی پێچەوانەی ڕیالیتەیتە «واقعیبوون». ئەو بەشەی ژیانە کە ناکەوێتە ناو واقیعەوە، بەو مانایەی کە واقیع لە تۆڕی ئەو شتانە پێکدێت کە دەتوانین یان بەخەیاڵ وێنایانبکەین یاخود بە زمان تەعبیریان لێبکەین، بیانڕەمزێنین یاخود بیانهێنینە قسە. بەڵام هەمیشە ڕووبەرێک هەیە کە نەدەتوانین بیکەینە ڕەمز نەدەتوانین بیکەینە قسە. ڕیال ئەو مەحاڵەیە کە ناگیرێت. گۆرانی مەزن لە دێڕە شیعرە ناودارەکەیدا لە هەر کەس جوانتر و ڕوونتر تەعبیری لە ڕیال کردوە کاتێک دەڵێت: «هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم/ بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم ـــ لێکدانەوەی دەرون، قسەی زمانم / بۆچی وەها لەیەک دوورن نازانم». گۆران لێرەدا تەواو تەعبیر لە ڕیال دەکات. ڕیال لای لاکان ئەو شتەیە کە گۆران باسیدەکات، ئەو خەیاڵەیە کە ناچێتە ناو هیچ چوارچێوەیەک و ئەو لێکدانەوەیەیە کە ناچێتە ناو زمانەوە، ئەو گینگڵە قووڵ و ئەو مۆتەکە قورس و ئەو خەونە نەگیراوەیە کە لە ناو هەمووماندایە و بەڵام ناتوانین بیگرین و بڵێین «ئەمە ئەو شتەیە کە دەمانەوێت». واتە ئەو ڕووبەرەی بوونە کە بەجۆرێک لە جۆرەکان لە عەقڵ و لە مانا ڕادەکات، ئەو ڕووبەرەی ڕۆحە کە سیستم دەستی پێیدا ناگات. ئەو شەبەقەیە کە وادەکات نەگەینە کەماڵ، واتە نەگەینە تێربوون، بەڵام دەرکەوتن و هەستپێکردنی تەواوی ڕوانینی ئێمە بۆشتەکان دەگۆڕێت، دەرکەوتنی ئەو درزە قووڵە ئاشکرادەکات کە لە خەیاڵ و زمانی ئێمەدا هەیە. لاکان بە سوود وەرگرتن لە چەمکی «وەدەرنراو» یان «وەلاوەخراو» لای جۆرج باتای و بە گەڕانەوە بۆ چەمکی «شت لە خۆیدا ـ Daś Ding

an sich» کانتی، ڕیال بەرجەستەدەکات. ڕیال ڕووبەرێکی وەدەرنراوە، لەدەرەوەی ناونانە، وەک شێتی دەکەوێتە ئەودیوی یاساکانەوە، هەروەها شت لە خۆیدای کانتیش ئەو شتەیە کە ناسینی مەحاڵە، لەگەڵ ئەوەشدا موتڵەقێکی ئەنتۆلۆژی وەدەردەخاتەوە «کای هامەرمایستەر. ل٥٩». واتە ئەو شتەیە کەدەزانین هەیە و نازانین ناوی بنێین، دەرکی پێدەکەین بەڵام ماهییەتی ناگرین.

زۆر گرنگە لێرەدا بڵێم کە بوونی ڕیال واتە هەبوونی ڕووبەرێک کە ڕەمزی و خەیاڵی پری ناکەنەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ڕیال ئیفلیجی بەرهەمدەهێنێت، بەپێچەوانەوە ئەو بۆشاییەی ڕیال دروستیدەکات، وادەکات بەردەوام گوتاری نوێ وەگەڕبخەین بۆپڕکردنەوە و گرتنەوە و داپۆشینی شەبەقەکەی. واتە ڕاستە ڕیال نابێتە ڕەمز، بەڵام هادەمی ڕەمزییە، ڕاستە نابێتە مانا، بەڵام خاڵی سفری مانایە کە بەبێ ئەو بوونی مانا نامومکینە «هـ. کانگ کیم. ل١٩». ئەو شتەیە کە وەرناگەڕێتە سەر ڕەمز، بەڵام بەبێ بوونی سیستمی ڕەمزیش هەست پێکردنی نامومکینە. لێرەدا وەک «ژیژیک» ئاماژەی پێدەدات، زۆر هەڵەیە ڕیال وەک مانایەکی نهێنی و شاردراوەی پشت شتەکان سەیربکەین، ڕیال نوشوستی سیستمی ڕەمزی دەردەخات، ئەو نوقسانی و لاوازییە ئاشکرادەکات کە لە ناو «ئەویدی گەورە A »دایە. ڕیال مانایەک نییە ونبوویێت، بەڵکو شەبەقێکە لە ناو سیستمی مانادا، مانەوەی شتێکە لەدەرەوەی مانا، ئەوەیە کە سیستمی ڕەمزی لە دۆخی ئیشکردن و دینامیکییەتدا ڕادەگرێت و وادەکات هەمیشە لەگەڕدا بێت «ژیژیک. ١٩٩١. ل ٥٤». ڕیال سنوورە، دوا سنوورە کە خەیاڵ و زمان دەیگاتێ و ئیدی لەوێدا بەر بەربەستێک دەکەون کە تێپەڕاندنی نەکردەیە، لێرەوە ڕیال نادیار و ترس و مردن و ئێشمان بیردەخاتەوە، دەبێتە ئەو بەشەی وجود کە هەمیشە لێمان هەڵدێت. بۆ نمونە سێکس لە هەر شتێکی

دی زیاتر ئەو دیوە نەگیراو و بێزمانە ئاشکرادەکات، هەموو لە سێکسدا بۆ شتێک دەگەڕێن کە کۆتایینی نایەت، بەڵام هەمیشە ئەو خواستە تێرنەبووە بەر سنوورێکی ناوەکی خۆی دەکەوێت، هەمیشە ویستێک هەیە بۆ پەڕینەوە بەرەو زیاتر و زیاتر. بەرەو داگیرکردنی زۆرتر و زۆرتر، بەرەو هەڵوەشاندنەوە و بینینی پتری ئەویدی، بەجۆرێک تا هەرجێگایەک بڕۆین هەمیشە ئەو هەستە لە ناوماندایە کە نەگەیشتووین، ئیدی ئەوەی ناویدەنێین لەزەت دەبێتە ژان، ئەوەی پێیگەیشتووین هەمیشە کەمە، ئەوەی تامانکردوە هەمیشە دەمانەوێت تێیبپەڕێنین. لاکان لەسەر ئەم ڕیتمە وشەی «چێژ» لە وشەی «لەزەت» یاخود «تام» جیادەکاتەوە. چێژ گەیشتنە بەودیوی تامکردن، هەوڵی نزیکبوونەوەیە لە مەحاڵ، بەرکەوتنی نێوان هەوڵی تێربوون و مردنە.

بەپێی لاکان سێکس، توندوتیژی، مردن هەموو هەڵگری ئەو شەبەقە ناوەکییەن کە بە مانا پڕناکرێتەوە.

لێرەدا دەبێت بپرسین: ئاخۆ چەمکی ڕیال، هەڵگری هیچ مانایەکی سیاسییە؟.

کاتێک دەڵێین ڕیال هەرەسی ڕەمزییە، واتە لە ناو دەسەڵاتدا شتێک هەیە بۆی کۆنترۆڵ ناکرێت. ڕیال ئەو سنوورەیە کە دەسەڵات لە بەردەمیدا چۆک دەدات... لێرەوە بە لۆژیکی لاکانی هیچ سیستمێک نییە مەرزی تێکشکان و هەرەسی نەبێت، هیچ بونیادێک نییە شەبەقێک لە ناو جەرگەیدا نەبێت، کە شەبەقی ڕیالە، شەبەقی هەرەسی ڕامکردن و دەستەمۆکردن و ناونانە.

بەڵام کە ڕیال نەیەتە زمان و قسەنەکات چۆن بزانین چییە؟.

بۆئەوەی ئەمە ڕوونبکەمەوە، کەمێک قسە لە سەر پەیوەندی نێوان ئارەزوو و بابەتی ئەلفی بچوک لای لاکان دەکەم. «بابەتی ئەلفی بچوک»، وەک لەسەریشەوە باسمکرد ئەو بابەتی ئارەزووەیە کە دەمانەوێت پێیبگەین

و پێیناگەین. ئەم بابەتە خۆی ناوەڕۆکێکی دیاریکراو یان ڕوخسارێکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو بە پێی گەشەی سوبێکت و بەپێی گۆڕانی ئارەزووەکانی ئەو وێنانە دەگۆڕێن کە دەچنە ناو چێوەکەیەوە، بێئەوەی هیچ وێنەیەک بتوانێت بە تەواوەتی پڕیبکاتەوە، واتە بابەتی ئەلفی بچوک ئارەزوو نییە بەرابەر شتێکی دیاریکراو، بەڵکو ئارەزووە وەک ئارەزوو، ئارەزووە بۆ ئارەزوو، واتە خواست نییە بۆ ئەم شت یان ئەو شت، بەڵکو خواستی هەبوونی خواستە، خواستە بۆ خواست، ویستی حەزکردنە لە ویست. ئێمە لە ڕێگای خەیاڵ و ڕەمزەوە دەمانەوێت ڕوخسار بدەینە شتێک کە دەستەمۆناکرێت، بەڵام بەبێ ئەم شتەش ئارەزووەکانمان دەمرێت. ئەلفی بچوک ڕوخسارێکە لە ڕوخسارەکانی ڕیال، ئەو شتەیە کە دەموچاوی نییە، بەڵام پێویستە بۆ ئەوەی هەموو شتەکانی دی هەبن، لێرەوە ژیژیک ئەلفی بچوک وەک کەرەستەی درێژبوونەوەی ئارەزوو تەماشادەکات، بەبێ ئەم «بابەتە نەگیراوە» ئارەزوو دینامییەت و بەردەوامی خۆی لەدەستدەدات. ئالێرەدایە ژیژیک، لاکان لە کولتووری پۆستمۆدێرنە جیادەکاتەوە، ئەوەی لای بونیادگەرەکان وەک بونیادێکی داخراو دەردەکەوێت، ئەوەی لای فۆکۆ وەک دەسەلاتێک دەردەکەوێت کە تۆڕێکی داخراوی دروستکردوە و دژایەتی دەسەلات بە دەسەلات دەکاتەوە ، لای لاکان لە ڕێگای چەمکی ڕیالەوە دەشکێت. هەموو دەسەلاتێک پنتێکی هەیە کە قەبوڵی تێکەڵبوون بە سیستمی ڕەمزی ناکات، قەبوڵی هاتنەقسە و کۆنترۆڵ ناکات. ئەم پنتە جێگای سەرهەڵدانی دونیایەکی جیاوازە، شوێنی دەرکەوتنی ئەگەری پێکهاتێکە کە هیچی لەم پێکهاتەی ئەمڕۆ نەچێت. لاکان وادەکات بە پشت بەستن بە پێکهاتی سوبێکت «نەوەک بە پشت بەستن بە گۆڕانکاری سیاسی ڕووت لە پەیوەندی هێزە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا» بشێت بیر لە دونیایەکی تر بکەینەوە و لە پرۆسەی شۆڕشی ڕوکەش و گۆڕانی ڕوکەش بترازێین،

بەرەو بیرکردنەوە لە سەرهەڵدانی شتێکی دی کە ڕادیکال لەوەی ئێستا نەچێت. ژیژیک بۆ ئەوەی ئەمدیوە شۆڕشگێڕییەی ناو فیکری لاکان ڕادیکالیزەبکات سەرەنجمان بۆ جۆرە تێگەیشتنێکی دیش لە سوبێکت ڕادەکێشێت کە جودایە لە تێگەیشتنی فۆکۆیی بۆ سوبێکت، کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێدا و لێرەدا وردتری دەکەمەوە. لای لاکان سوبێکت شتێک نییە یەکجار لە ناو سیستمی ڕەمزیدا نوقمبێت و ئیدی دەربازبوونی نەبێت، پێشتر هەریەک لە چەمکی بونیاد یاخود دیسپۆزێتیڤی فۆکۆیی «بڕوانە بەشی تایبەت بەم چەمکە لە کتێبی ئیمان و جەنگاوەرانی» یان چەمکی «هەبیتۆسی» بۆردۆیی «بڕوانە وتارەکەمان خۆدزینەوە لە ئازادیی بە ناوی ئازادییەوە، لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامەدا بە تایبەت ئەو بەشەی کە لە ژێر ئەم ناونیشانەدایە ــ چەمکی هەبیتۆس لای پیار بۆردیۆ و کێشەی سوبێکت و ئۆبێکت لە سۆسیۆلۆژیادا ــ ». دوو بازنەی داخراو بۆ سوبێکت دروستدەکەن، سوبێکت هەمیشە ئەوەیە کە ئەوی دی دروستیدەکات. بەڵام لای لاکان سوبێکت چێوەیە، سوبێکت،چاڵە، دەتوانێت زیاد لە فۆرمێک وەربگرێت. ئیدی سوبێکت هەر ئەوە نییە کە سیستمی ڕەمزی دروستیدەکات، هەر ئەوە نییە کە هەیە، بەڵکو سوبێکت پرۆسەیە، گەڕانە بەدوای پڕکردنەوەی مەحاڵدا، سوبێکت ناگات بە خۆی، سوبێکت ناتەواوییە، بەڵام هێزی گەورەشی لەم نەگەیشتنەیدایە بە خۆی.

بۆ ئەوەی باشتر لەمە تێبگەین دەبێت بگەڕێینەوە بۆ چەمکی «نەست» لای لاکان. بەبڕوای ژیژیک، نەستی لاکانی تەبایی مرۆڤ لەگەڵ جیهان و سیستمدا بەرجەستەناکاتەوە، نەست جێگای ئەو شتانە نییە کە دەبێت لە جیهان و سیستمی بشارینەوە و بیخەینە فۆرمێکی ڕەمزی قەبووڵکراوەوە، بەڵکو نەست جێگایەکی قووڵی ناتەبایی لە نێوان مرۆڤ و جیهاندا بەرجەستەدەکات، ئەو درزەیە کە کەوتۆتە نێوان مرۆڤ و

دونیـاوە. واتـە لـە سـوبێکتدا ڕەگەزێکـی هەمیشـەیی ئاتەبایـی لەگـەڵ دونیـادا هەیـە کـە نەسـتە، واتـە هەڵەیەکـی گەورەیـە سـوبێکت وەک بوونەوەرێـک ببینیـن کـە تەنیـا پنتـی تەبایـی لەگـەڵ جیهانـدا لـە خۆگرتـووە، یـان بـە واتـای هایدگـەر «بوونـە لـە جیهـان» دا، نـا... سـوبێکت بـە دیوێکـی دیکەدا نەفیکردنـی جیهانـە، ئـەو جێگایەیـە کـە تێیـدا جیهـان دەردەکەوێـت و ونیشـدەبێت. لێـرەوە گـەر یەکێـک لـە دەرەنجامـە پێشـووەکان لەسـەر سـوبێکت فۆرمـەلا بکەینـەوە، دەڵێیـن سـوبێکت درزێکـی پڕنەکراوەیـە لـە نـاو سیسـتمی ڕەمزییـدا، ئـەو جێگایەیـە کـە سیسـتم دەیەوێـت داگیریبـکات، ئەو مەحاڵەیـە کـە سیسـتم ناتوانێـت چۆکـی پێبـدات، لـەم خاڵەشـدا ژیژیـک جیاوازییەکـی گرنـگ لـە نێـوان لاکان و دیریـدا دا دەبینێـت. دیریـدا سـوبێکت وەک «ناتـەواو» تەماشـادەکات، بـەڵام لاکان سـوبێکت وەک «ناتەواویـی» تەماشـادەکات «هـ. کانـگ کیـم. ل٩٢». سـوبێکت ئـەو شـتە نییـە کـە ناتوانێـت خـۆی تەواوبـکات، بەڵکـو ئـەو ناتەواویەیـە کـە تـەواو ناکرێـت. سـوبێکت تەنیـا ئـەو شـتە نییـە کەدەرەوە دروسـتیدەکات، بەڵکـو ئـەو شـتەیە کـەدەرەوە ناتوانێـت بەتەواوەتـی دروسـتیبکات، ئازادییەکـەی تەنیـا لـەوەدا نییـە کـە دەتوانێـت نەفیکەرێکـی ڕادیـکاڵ بێـت، نیگەتیڤانـە سـەیری سیسـتم بـکات، بەڵکـو لەوەدایـە کـە سیسـتم ناتوانێـت بیگرێـت. هەڵبـەت سـوبێکت لـە نـاو قسـەدا دەردەکەوێتـەوە، لـە نـاو زمانـەوە سـەردەردەهێنێت، بـەڵام هەمیشـە نەگووتراوێکـی مەحـاڵ هەیـە کـە زمـان بـۆی ناگیرێـت، بەکارهێنانـی زمـان سـوبێکت دەخاتـە نـاو سیسـتمەوە، بـەڵام هەمیشـە پاشـماوەیەک دەمێنێتـەوە کـە لـە دەسـتدەردەچێت و ئـەو درزی ناتەبایـە قووڵـەی نێـوان مـرۆڤ و دونیـا بەرجەسـتەدەکات. لێـرەوە کـە لـە سۆسـیۆلۆژیا و سیاسـەتی هاوچەرخـدا چەمکێکـی وەک «دۆخـی نائاسـایی» شـوێنێکی گرنـگ وەردەگرێـت، لـە بەرئەوەیـە دۆخـی نائاسـایی «کـە بەبڕوای ئاگامبـن دۆخێکـی هەمیشـەییە» ئـەو دۆخـە پیشـاندەداتەوە کـە لـە هەنـاوی

سیستمی ڕەمزیدا، لە هەناوی دەسەڵاتدا شتێک هەیە بۆ ئەبەد بە نەگیراوی دەمێنێتەوە... «دۆخی نائاسایی» لە سیستمدا ڕاگەیاندنی ئەوەیە کە شتێک هەیە دەستی بەسەردا نەگیراوە. بە کورتی ئازادی هیچ نییە جگە لەدەرکەوتنی ڕیال، واتە دەرکەوتنی ئەو ڕەهەندەی بوون کە کۆنترۆڵ ناکرێت و دەستی بەسەردا ناگیرێت.

بەڵام لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشێ: گەر نەست لە ناوەڕاستی ژیانماندا وەک هێزێکی ناتەبایی چەقیبێت، ئەی سیستم چۆن ئیشدەکات؟.

بۆئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، دەبێت سەرەتا ئاماژە بە تێزێکی گرنگی فرۆید بدەم کە دەڵێت «نەست ئەبەدییە»، بەڵام نەست تەنیا ڕووبەری ئەبەدی ناو مرۆڤ نییە، بەرامبەریشی وەک ئالتۆسێر دەڵێت ئایدۆلۆژیاشمان هەیە کە ئەبەدییە، وەک ئالتۆسێریش جەغتی لەسەر دەکات لە نێوان ئەبەدییەتی نەست و ئەبەدییەتی ئایدۆلۆژیادا پەیوەندی هەیە. «بڕوانە ئالتۆسێر لای پێتەر شۆتلە. ل ١٣٣». خوێندنەوەی ئالتۆسێر بۆ ئەم پەیوەندییە جیاوازە لە خوێندنەوەی «لاکان». لای ئالتۆسێر سوبێکت ئەو شتەیە کە وادەکات ئایدۆلۆژیا ئیشبکات و چالاک بێت، واتە ئایدۆلۆژیا فەردەکان وەک سوبێکت بانگدەکات، لە ڕێگای ئایدۆلۆژیاوە سوبێکت شوێنی خۆی لە جیهاندا دەناسێتەوە، سوبێکت بە ڕای ئالتۆسێر تەنیا لە ناو سیستمی ڕەمزیدا دەتوانێت دروستبێت و خۆی بناسێت، ئەم تێزەیەش تەواو لە تێڕوانینی لاکانی دووردەکەوێتەوە. «ملادن دۆلار» بە ڕوونی تەعبیری لەم جیاوازییە کردوە کاتێک دەڵێت «لای ئالتۆسێر سوبێکت وەگەڕخەری ئایدۆلۆژیایە، بەڵام لای دەروونشیکارەکان سوبێکت لەو جێگایەدا دروستدەبێت و سەرهەڵدەدات کە ئایدۆلۆژیا نوشوست دەهێنێت» یان دەڵێت «سوبێکتی دەروونشیکار نوشوستی سوبێکتە لەوەی ببێت بە سوبێکتی ئالتۆسێری» «دۆلار. ل١٢». بەزمانێکی تر لای ئالتۆسێر سوبێکت ئەوەیە کە دەکەوێتە ناو ڕێکخستنی ڕەمزی و ناو

تۆری سەمبولییەوە، واتە دەکەوێتە ئەو داوەوە کە «ئەوی گەورە» یاخود «دەسەڵات» بۆیدانـاوە، بەڵام لای لاکان و ژیژیـک و دۆلاریـش، سـوبێکت ئەو شتەیە کە ناکەوێتە ناو تـۆری ڕەمزییـەوە و لێیـڕادەکات. لێـرەدا نامەوێت بچمە ناو وردەکارییەکانی مەسەلەی سوبێکتەوە لای ئالتۆسێر و دۆلار و ئەوانی دی، بەڵام دەخـوازم ئاماژە بەوەبدەم گەر سوبێکت نەفیکەر و دەرەکۆنتـرۆڵ بێـت، ئەوا بـۆ تێگەیشـتن لـە ئیشـکردنی سیسـتم هـەر یـەک لـە «فەنتازیـا» و «ئایدۆلۆژیـا» دوو ڕۆڵـی گرنـگ دەبینـن. گرنگی لاکان لێرەدایـە کـە ئەگـەری سـەرهەڵدانی هەمـوو سیسـتمێکی داخـراو، ئەگـەری بوونـی ئەوێکـی گـەورە کـە نوقسـانییەکی قـووڵ یـان درزێـک لـە ناوەندیـدا نەبێـت، دەکاتــە دەرەوە، واتــە ئایدۆلۆژیـا هەوڵـی پڕکردنـەوەی درزەکەیـە نـەوەک پڕکردنـەوەی تەواوەتـی بێـت. ئـەو تێزەیـەی لاکلاو و مۆف کە لە وتـاری پێشـوودا باسمکرد «سـەبارەت بـە نەبوونـی کۆمەڵـگا» درێژکـراوەی ئـەو تێزەیـەی لاکانـە سـەبارەت بـە سـوبێکت وەک پنتێـک لـە دەرەوەی سیسـتمی ڕەمـزی، وەک نەبوونـی سیسـتمێکی داخـراو، وەک بوونـی نوقسانییەکی هەمیشـەیی لـە «مـن» و لـە «ئەویدی» شدا. بە ڕای ژیژیـک سیسـتم یـان کۆمەڵـگا بـۆ ئەوەی ئـەو درزە لاکانییـە دابخات، دەبێـت پـەردەی بەسـەردا بـدات و دایپۆشـێت و لـە شـێوەی دیکـەدا بەرجەسـتەییکات. لای ژیژیک فەنتازیـا و ئایدۆلۆژیـا ئـەو ڕۆڵـە دەبینـن کـە چاڵـی نێـوان «ریاڵ» و «ڕێکخسـتنی ڕەمـزی» دادەپۆشـن. بـۆ نمونـە بـەوەدا گەیشـتن بـە کۆمەڵـگا وەک یەکەیەکـی هارمۆنـی و تـەواو مەحـاڵ و نەکردەیـە، دەبێـت ئـەم مەحاڵـە جەسـتەیەک و ناوێکـی بدرێتـی بۆئـەوەی ئـەو یەکێتییـە خەیالـی و ڕەمزییـەی کۆمەڵـگا ببێـت بـە شـتێکی لۆژیکـی و سیاسـی و قەبووڵکـراو، واتـە گـەر کۆمەڵـگا یەکێتییەکـی درۆزن بـۆ خـۆی دروسـت نـەکات نابێتـە کۆمەڵـگا. بـۆ نمونـە دژایەتیکردنـی «جـووەکان» لـە سـەردەمی نازییەتـدا نمونەیەکـی ئاشـکرای ئـەم دۆخەیـە، نازییـەکان هـۆی نەگەیشـتنی کۆمەڵـگای ئەڵمانیـان

بە دۆخێکی بێخەوش و تەواونیگار لە جووەکاندا دەبینییەوە، جووەکان وەک هێمای ئەو شەبەقە، وەک سەمبولی ئەو دانەخرانەی کۆمەڵگا بوون کە دەبایە بەلاوە بنرێن، تا کۆمەڵگای ئەڵمانی بگاتە دۆخی کەماڵ. بەعسییەکان لە عێراقدا ئەو مەحاڵەی دروستبوونی کۆمەڵگای عێراقیان دەخستە ئەستۆی کورد. بە گشتی لە هەموو کۆمەڵگا و هەموو ساتێکی مێژوویدا کەسێک یان گروپێک هەن کە بە هۆ و هۆکاری دروستبوونی درزە کۆمەڵایەتییەکە لەقەڵەمدەدرێن، دەکرێن بە بەهانەی نەگەیشتنی کۆمەڵگا بە دۆخی نائەنتاگۆنیستی خۆی. گەر لەم وێنەیە وردببینەوە دەبینین کە ئایدۆلۆژیا دەمامکێکی گەورەیە جیاوازی نێوان رێکخستنی رەمزی و رییال دەشارێتەوە. بەم مانایە ئایدۆلۆژیا چیتر جۆرە «هوشیارییەکی درۆزن» نییە وەک مارکس دەڵێت، بەڵکو رەگەزێکی سەنتراڵ و گرنگی دروستبوونی کۆمەڵگایە، ئایدۆلۆژیا چیتر وێنەیەکی هەڵەی واقیع نییە، بەڵکو دروستکەری واقیعە، رۆڵی لە پێکەوەنان و خولقاندنی واقیعدا هەیە، هەم بەرجەستەکەری سروشتە ناکۆک و ئاناگۆنیستییەکەیە، هەم چارەسەرکەر و پەردەپۆشکەری ئەو سروشتەشە. لێرەوە بەسەرێک ئایدۆلۆژیا و بەسەرێکی دی واقیعمان نییە کە بەرابەری یەک وەستابن، بەڵکو واقیعێکمان هەیە کە ئایدۆلۆژیا دروستیدەکات و ناویدەنێت و مانای دەداتێ، چونکە وەک ژیژیک دەڵێت ئەوەی لە ژێر دەمامکی ئایدۆلۆژیاوەیە بە کاریگەری دەمامکەکە دروستبووە، کۆمەڵگا جەوهەرێکی نییە ئایدۆلۆژیا شاردبێتییەوە، بەڵکو کۆمەڵگا خودی ئەو شاردنەوەیەیە، خودی دەمامکەکەیە، دەمامکەکە ئەو شتە دروستدەکات کە دەیشارێتەوە.

بەڵام ئەم دەرەنجامانە چ مانایەک دەدەن بەدەستەوە؟ لەسەرێکەوە دەڵێین ئایدۆلۆژیا ئەبەدییە، لە سەرێکی تریشەوە دەڵێین ئایدۆلۆژیا واقیع دروستدەکات و ئایدۆلۆژیا دیواری نێوان ئێمە و حەقیقەت نییە،

بەڵکو حەقیقەت لەدەرەوەی ئایدۆلۆژیا دەرکی پێناکرێت... ئاخۆ ئەمە گەڕانەوەیە بۆ ستایشی ئایدۆلۆژیا؟. بێگومان نا، بەڵکو تەفسیرێکی نوێیە بۆ ئەو جێگایەی کە «ئایدۆلۆژیا» بە «ئاسۆکانی ڕەخنە لە ئایدۆلۆژیاوە» گرێدەدات.

بۆئەوەی لەمە تێبگەین دەبێت باشتر لە پەیوەندی ئایدۆلۆژیا و ڕیال تێبگەین.

ڕیال ئەو جێگا خاڵییەیە کە هەوڵدەدەین پڕیبکەینەوە بەڵام هەمیشە هەر خاڵییە، واتە ڕیال سەرەتای سەرەتایە، ئەو ڕووبەرەیە کە دەکەوێتە پێش قسە و ڕەمزاندن و مانا و خەیاڵەوە. بۆ ئەوەی لە وێنەی ئەم شوێنە تێبگەین کە دوای پڕکردنەوەی هەر خاڵییە، پەنا دەبەمە بەر نمونەیەک کە زۆر نوسەر بۆ ڕاڤەکردنی ئەم دۆخە بەکاریدەهێنن، نمونەیەک کە لە یارییەکی پەزڵی منداڵانەوە وەردەگیرێت. لەم یارییەدا وێنەیەکی پارچە پارچەمان هەیە کە لە هەشت پارچە پێکدێت، هەر هەشت پارچەکە لە ناو چوارچێوەیەکدا دادەنرێن و تێکەڵدەکرێن کە بەسەر نۆ بەشدا دابەشکراوە، واتە چوارچێوەکە لە ناوەوە کراوە بە نۆ چوارگۆشەی یەکسانەوە، وێنە هەشت پارچەکەش لە ناو هەشت بەشی چوارگۆشە «نۆبەشەکەدا» دانراون، بەم پێیە هەمیشە یەک چوارگۆشە لە نۆ چوارگۆشەکە بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، ئێمە ئەو پارچە بەتاڵە وا بەکاریدەهێنین بۆ جوڵاندنی پارچەکانی دی بۆئەوەی بتوانین کەرتە وێنەکان بە جۆرێک بجوڵێنین لەدوا دەرەنجامدا وێنەی پەزڵەکە بە تەواوی دروستبکەین. چوارگۆشە بەتاڵەکە، ئەو چوارگۆشەیەیە هەر کاتێک بە پارچەیەک پڕمانکردەوە، شوێنی پارچەکەی پێشوو بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، واتە لە ناو چوارچێوەی پەزڵەکەدا هەمیشە جێگایەک هەیە بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، چاڵێک هەیە دەگەڕێت، هەر هێندەی بە نیگارێک پڕمانکردەوە، لە تەنیشتییەوە جێگایەکی خاڵی دروستدەبێتەوە.

جێگا خاڵییەکە «کە هەمیشە پڕدەکرێتەوە و دووبارە دروستدەبێتەوە» ئامانژەیە بۆ ڕیال، پارچەکانی وێنەکەش کە دەیانجوڵێنین، ئامانژەن بۆ سیستمی ڕەمزی کە بەردەوام پێویستی بە جێگایەکی بەتاڵ هەیە تا ئامانژەکان «داڵەکان» بتوانن بجوڵێن و ڕێکخستنی نوێ و جیاواز دروستبکەن، پڕکردنەوەی تەواوی وێنەکە و داخستنی چاڵەکە، مانای نەمانی جوڵە و ئەگەری جوڵە، مانای داخستنی سیستمی ڕەمزی بۆ ئەگەرەکانی خۆی، مانای نەمانی ئارەزوو لە شتێکی دی، مانای مردن... مردنی تەواوەتی.«بۆ زانیاری تەواو لەسەر ئەم شوبهاندنە بە پەزل، بڕوانە: شتێفان گریگۆر، دەقی سیمینارێکی وێنەیی لە شتوتگارتە مێرتز ئەکادیمی». واتە ئەم مۆدێلە هەمیشە لەبەردەم دوو ئەگەر و دوو هەڕەشەدایە، یەکێکیان ئەوەیە ئەو چوارچێوەیە بشکێت کە سیستمی ڕەمزی ڕاگرتووە و کاری ڕێکخستنی ڕەمزی ئاساندەکات، بە شکاندنیشی ناڕێکی و لێکترازانێکی گەورەی مانا دروستببێت و ڕەگەزەکان بکەونەوە ناو بێدەنگی و تاریکی و بێناوی ناو جیهانی «ڕیالەوە»، یاخود وێنەکە لە ڕێگای فەنتازیایەکی نادروستەوە دابخەین و بمانەوێت لە ڕێگای توندوتیژییەوە، جۆرێک لە سفتی و سافی و یەکێتییەکی زۆرەملێی بەسەردا بسەپێنین. کەوتنە ناو ڕیالەوە بەتەواوەتی، واتە گەڕانەوە بۆ دۆخی بەر لە بەگەڕکەوتنی خەیاڵ و ڕێکخستن و مانا، واتە دابەزین بۆ فەوزا و ناڕێکی تەواوەتی. داننەنان بە ڕیالیشدا مانای قفڵکردنی کۆمەڵگا و سیستمە ڕەمزییەکەی لە ناو یەک مانادا. لەجەوهەردا وەک ژیژیکیش سەرەنجەدەدات، ڕیال خۆی هیچ نییە، ناوی نییە، مانای نییە، ئەوەی کە وێنایدەکات و ناوی دەداتێ ئایدۆلۆژیایە، واتە مەسەلەکە ئەوە نییە کە ڕیال جەوهەر بێت و ئایدۆلۆژیا ڕوکار «مەزهەر» بێت، بەڵکو ئایدۆلۆژیا ئەو مەزهەرەیە کە جەوهەر دروستدەکات، چونکە ڕیال هیچ نییە جگە لەو وێنەیەی کە ئێمە لە ڕێگای ئایدۆلۆژیاوە

بـۆی دروسـتدەکەین. «هـ. کانـگ کیـم. ل٦٤». دەرکەوتنـی ڕیـال تەنیـا لـە ڕێـگای سیسـتمی ڕەمـزی و ئایدۆلۆژیاکانییەوەیەتـی، لـەدەرەوەی ئـەو وێنەیـەش نیگارێکـی تـری ئەومـان لـەلا نییـە، واتـە هەمـوو پێکەوەنانێکـی ڕیـال پێکەوەنانێکـی ڕەمزییـە. مـرۆڤ ناتوانێـت پەیوەنـدی نێـوان ڕیـال و ئایدۆلۆژیـا لـە یـەک بترازێنێـت، ئەبەدییەتـی ئایدۆلۆژیـا لەوێـوە دێـت کـە گرنگـە بـۆ تەعبیرکـردن لـە ڕیـال؛ بـۆ ناونانـی ئـەو شـتانەی کـە ناویـان نییـە، لێـرەوە بـێ ئایدۆلۆژیـا ڕیـال نایەتـە قسـە، بـەڵام هێنـدەی ئایدۆلۆژیـا هاتـە قسـە دەزانیـن کـە شـتێک هەیـە هێشـتا مـاوە و نوقسـانییەک و درزێـک و ناتەواوییـەک لـە ناویـدا نوسـتوە کـە تەواوناکرێـت، لێـرەوە جارێکـی تـر بـە نـاوی ڕیالـەوە دەکەوینـەوە ڕەخنـە لـە ئایدۆلۆژیـا. بـە کورتـی ئایدۆلۆژیـا ئـەو ڕێگایەیـە کـە لـە ڕیـال دەمانهێنێتـە دەرەوە، ئـەو ڕێگایەشـە کـە دەبێـت بەجێیبهێڵیـن بۆئـەوەی جارێکـی دی ڕیـال بدۆزینـەوە.

ڕیـال لـە یەککاتـدا هـەم سـەرچاوەی ترسـە «چونکـە سـەرزەمینی شـتە بێنـاو و تاریـک و نادیارەکانـە»، هـەم سـەرچاوەی یاخیبوونـە «چونکـە هێزبەخشـی نەفیکردن و هۆکاری سـەرهەڵدانی جیاوازی ڕادیکاڵ و نیشـتیمانی دەرکەوتنـی شـتەکانی دیکەیـە کـە لـە شـتەکانی ئێسـتا ناچـن». لێـرەوە لـە نێوان چەمکـی ڕیالـی لاکانـی و چەمکـی شۆڕشـدا نزیکییەکـی زۆر هەیـە، ڕیال وەک شـۆڕش دیوێکـی شـکاندنی سـەمبوڵە کۆنەکانـە و جێـگای هەرەسهێنانی ڕێکخسـتنە بونیادییەکانـی ئێسـتایە، دیوەکـەی تریشـی لەدایکبوونـی نارێکـی و لەدەسـتدانی مانـا و نەمانـی شـیرازە و شـێتییە. ئێمـە ناتوانیـن بەبـێ شـاردنەوە و بێدەنگکردنـی ڕیـال لـە ڕێـگای داپۆشـینییەوە بـە خەیـاڵ و ڕەمـز بژیـن، بـەڵام ناشـتوانین بەبـێ ئاشـکراکردنەوەی ڕیـال لـە دەسـەڵاتی ڕەمـزی و هێـزی «ئەویـدی گـەورە» دەرچیـن ، واتـە ڕیـال شـتێک نییـە تەنیـا لـە ڕێـگای خـەون و مۆتەکـە و تـرس و دەرکەوتـە عوسـابییەکانەوە بگەڕێتـەوە، بەڵکـو لـە ئاسـتی کۆمەڵایەتیـدا لـە شـێوەی شـۆڕش و گۆڕانـی ڕادیـکاڵ و

هەرەسی کتوپڕ و تێکشکاندنی لە ناکاوی مانا و داکەوتنی سیستمە ڕەمزییەکانیشەوە دەگەڕێتەوە. وەک ژیژیک پێی لەسەردادەگرێت تەنیا بە ئیشکردن و یاریکردن لە نێوان ڕیال و ڕیالیتی «سیستمی ڕەمزی و دەسەلآت» و ئایدۆلۆژیادا دەتوانین لە ئیشکردنی سیستم تێبگەین و لۆژیکی نەفیکردن و ئەگەری شکاندنی سیستمیش بپارێزین. لێرەوەیە دەتوانین لاکان وەک هیگڵ بە بیریاری نەفیکردن بزانین. لاکان دەمانخاتە بەردەم ئەو ڕاستیەی کە کۆنترۆڵکردنی هەتاهەتایی مرۆڤ مەحاڵە. هەندێک جار ڕیالی لاکانی تەواو وەک وێنەیەکی پێچەوانەی هەربەرت مارکۆز دەبینم کە باس لە مرۆڤی تاک ڕەهەند دەکات... بەپێی لاکان مرۆڤی تاک ڕەهەند یان کۆمەڵگای تاک ڕەهەند یاخود مێژووی یەک ئاراستە بوونیان نییە، هەمیشە ڕەهەندێک هەیە کە لەدەسەلآت ڕادەکات، کە سیستم نایگرێت و بەسەر دونیایەکی تری جیاوازدا دەکرێتەوە. لێرەوە لە ناو سیستم و کولتووری هونەری و ئەدەبی سیستمدا ترسێکی گەورە لە گەڕانەوەی ڕیال هەیە، لە فلیمەکانی هۆلیوود دا، لە ئەدەبیاتی خەیاڵی زانستیدا، لە هونەری شێوەکاری مۆدێرندا ڕیال بەشێوەی جۆراوجۆر تەعبیر لە خۆی دەکات، وەک هێزێکی ترسناک، وەک بۆمبێکی ئەتۆمی شاردراوە کە دونیا وێراندەکات، وەک ئەو جانەوەر و دەعجانانەی لە فلیمە خەیاڵییەکاندا دەردەکەون، وەک ئەو ئەنگوستیلە سیحراوییەی لە فلیمی «سالاری ئەنگوستیلە»دا دەیبینین. کە ئەگەر نەبرێت و وێران نەکرێت مرۆڤایەتی دەخاتە بەردەم ڕەحمەتی هێزێکی جانەوەرئاسای تارێک، بەلآم لە هەندێک ئاستی تریشدا وەک فریادرەسێکی غەیبی، وەک ڕێگایەکی باریک لە جەنگەڵێکی تاریکدا کە بەرەو دڵنیایی دەمانبات دەردەکەوێت.

ئەزموونی مرۆڤایەتی لەسەدەی بیستدا ئەزموونێکی تاڵ بوو، لە دوا دەرەنجامیدا بەوە کۆتاییهات بڵێین دەرچوون لەم سیستمەی ئەمڕۆی

دونیا نامومکینە، دوای ئەوەی پرۆژەی مارکسیستی لە ڕوخانی سیستمەوە بە دروستکردنی سیستم کۆتاییهات. یەکێک لەو کۆڵەکە گەورانەی سیستمی جیهانی ئەمڕۆ پشتی پێدەبەستێت ئەو خۆ وێناکردنەیە وەک فۆرمێکی ئەبەدی، وەک ئەزموونێک دەرگای بەرەو دەرەوەی خۆی تێدا نییە ، لێرەوە چەمکی ڕیالی لاکانی، تێگەیشتنی لاکان لە سوبێکت، سەیرکردنی بۆ نەست وەک خاڵێکی ناتەبایی ئەبەدی لەگەڵ جیهاندا، پرسیارگەلێکی فەلسەفی گەورە و دژ دەخاتە بەردەم هەر سیستمێک بانگەشەی ئەبەدییەت بکات. هەمیشە لە ناو مرۆڤدا ڕەهەندێک هەیە کە وێنەی مرۆڤی تاک ڕەهەند دەشکێنێت. لە ناو مرۆڤدا دیوێک هەیە ناهێڵێت لە ناو هیچ سیستمێکدا بتوێتەوە، ئەوە ئەو تێزە لاکانییە گرنگەیە کە بۆ دونیای ئەمڕۆ زۆر پێویستمان پێیەتی. واتە شتێکی گەورە لە ڕۆحی نەفیکار لە لاکاندا هەیە کە پرۆژەی دەستەمۆکردنی ئەبەدی مرۆڤ و تواندنەوەی لە سیستمدا و گۆڕینی بۆ بوونەوەرێکی خولقاو نەوەک خولقێن پەکدەخات، من لێرەدا ناکۆکییەکی قووڵ نابینم لە نێوان چەمکی «مرۆڤ مەحکومە بە ئازادی» لای سارتەر و ئەم تێگەیشتنە لاکانییە کە تێیدا مرۆڤ بە حوکمی ڕەهەندێکی گرنگی سوبێکت، مەحکومە بە توانای لەسەر تێپەڕاندن، لەسەر نەتواندنەوە لە سیستمدا. مرۆڤ هەمیشە دەرگایەکی بەرەو گۆڕان و خۆ ڕاپسکاندن و تێکشکاندنی سیستم بۆ دەمێنێت ، هەمیشە درزێک دەمێنێتەوە کە ناگیرێت و لەوێوە شتی نوێ سەرهەڵدەدات... ئەمە ئەو تێزە لاکانییەیە کە ژیژیک ورد ئیشی لەسەردەکات، بە جۆرێک ئەمڕۆ ژیژیک بە فەیلەسوفی ڕیال ناوزەد دەکرێت، تێزێک کە بەجۆرێک گرنگە ناکرێت ئێمەش فەرامۆشیبکەین.

# سەرچاوەکان

Alain Juranville. Der psychoanalytische Diskurs nach Lacan. In: RISS-Extra 1. RISS-Verlag. Zürich.1994

J. Lacan.Schriften II, ausg. und herausg. von Norbert Haas. Freiburg. Olten.1973

Gerda Pagel. Jacques Lacan zur Einführung.Hamburg . Junius.2007

Kai Hammermeister. Jacques Lacan .München. C.H.Beck. 2008

Klaus-Michael Bogdal (Hg.). Neue Literaturtheorien. Eine Einführung. Westdeutscher Verlag. Opladen. 1990

Weber, S. Rückkehr zu Freud. Jacques Lacans Ent-stellung der Psychoanalyse. Passagen. Wien 2000

Widmer, P. Metamorphosen des Signifikanten. Zur Bedeutung des Körperbildes für die Realität des Subjekts. Transcript. Bielefeld. 2006

Peter Widmer, Subversion des Begehrens. Jacques Lacan oder Die zweite Revolution der Psychoanalyse. Fischer. Frankfurt / M. 1990

Francois Dosse. Geschichte des Strukturalismus. Band 1. Das Feld des Zeichens 1945-1966. Fischer. Frankfurt/ M. 1999

Desiree Laubenstein. Sonderpädagogik und Konstruktivismus. Behinderung im Spiegel des Anderen, der Fremdheit und der Macht. Waxmann. 2007

Slavoj Zizek, Liebe Dein Symptom wie Dich selbst! Jacques Lacans Psychoanalyse und die Medien, Berlin 1991

Peter Schöttler(Hrsg). Ideologie und ideologische Staatsapparate. Aufsätze zur marxistischen Staatstheorie. Hamburg/Berlin 1977

بۆ سەیرکردنی موحازەرەکەی شتیڤان گریگۆریش بڕوانە ئەم ناونیشانە:

www.archive.org/details/StephanGregoryJenseitsDes-fun-puzzlelacan

# ناسیونالیزمی کوردی و مۆدێرنە

چاوێکەوتنی گۆڤاری مەهاباد

سازدانی : کەمال حەسۆ

**پرسیار: لە خوێندنەوەی شیعرەکانی کەسێکی وەکو حاجی قادری کۆییدا، وادەردەکەوێت بنەما فیکرییەکانی مۆدێرنیتە و بیری نەتەوەخوازی هەردووکیان پێکەوە لە بەستێنی ڕوانینی نوخبەی کوردیدا سەریانهەڵداوە، بە بڕوای ئێوە چ پەیوەندییەک لە نێوان مۆدێرنیتە و ناسیونالیزمی کوردیدا لە ئارادا هەبووە؟ ئەو پەیوەندییە لەسەرەتادا هەرچۆنێک بووە، ئایا دواتریش چۆنێتی پەیوەندییەکە وەک خۆی ماوەتەوە، یان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.**

وەڵام: بێگومان ناسیونالیزمی کوردی وەک گووتار، گرێدراوی کۆمەڵێک مەرجی بنەڕەتییە کە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە زەمینەی ڕاستەقینەیان نییە. لەوانە ١. لاوازبوونی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی و هەرەسهێنانی. ٢. لاوازبوونی نوخبەی دینی. ٣. دروستبوونی سیستمێکی نوێی کۆمۆنیکاسیۆن «پەیوەندی» کە مرۆڤ لە سنووری دونیای بچوکی خۆی بباتە دەرەوە. بەبڕوای من بەبێ ئەو هەرەسە گەورەیەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کوردی بەو فۆرمەی ئێستای قابیلی پێشبینیکردن نییە. سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی

کوردی بەبڕوای من دەرەنجامی دوو هۆکاری سەرەکییە، کە هەردووکیان لە سەرهەڵدانی ناسیونالیزمدا ڕۆڵێ باڵا دەگێڕن، زەمینەیەکی مێژوویی و واقیعی کە هەرەسی سیستمی ئیمپراتۆریی پێشکەشماندەکات، لەگەڵ زەمینەیەکی فەنتازی، واتە زەمینەیەک بوار بۆ بیرکردنەوە و خەیاڵکردنەوە لە شێوە پێکهات و جەستەیەکی کۆمەڵایەتی دی خۆشدەکات. بەبڕوای من سەرەتا مۆدێرنە زەمینە خەیاڵی و فەنتازییەکە پێشکەش بە ناسیونالیزمی کوردی دەکات. مۆدێرنە تا ئەمڕۆش هەر لە فەراهەمکردنی ئەو زەمینە فەنتازییەدا بۆ ناسیونالیزمی ئێمە هەر ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. لای حاجی خەونەکانی ناسیونالیزم و خەونەکانی مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگا تەواو تێکەڵاوبووە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەم تێکەڵاوییە ئامانجی باڵای ناسیونالیزمی سیاسیش بووە. لێرەدا دەبێت جیاکاری لە نێوان کۆمەڵێک ئاستی جیاوازی ناسیونالیزمی کوردیدا بکەین... ناسیونالیزم لەسەرەتاوە جۆرە «ئامازەیەکی خاڵی» بووە، واتە بەردەوام ئامازەبووە بۆ زیاد لە خەونێک و زیاد لە جۆرە بیرکردنەوەیەک. ئەوەی لەسەرەتاوە پەیوەندی ناسیونالیزمی کوردی بە مۆدێرنەوە زۆر سەخت و دژوار کردوە، ئەوەیە لە پاڵ ئامادەگی پرۆژەیەکی سیاسی بۆ ناسیونالیزم، ئامادەگی پرۆژەیەکی فیکری بۆ مۆدێرنیزەکردن نابینینەوە، واتە خەونەکەی حاجی تا ئەمڕۆ هەر وەک خەون ماوەتەوە... مۆدێرنیزەکردن لەلای هەموو نوسەرانی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست لە ئاستی خەون و فەنتازیادا دەمێنێتەوە، ئەم پرۆسەیە لە حاجییەوە دەست پێدەکات و تا لای قانیعیش «کە بەبڕوای من مۆراڵی ناسیونالیستی لەلای دەگاتە لوتکەی فۆرمی خۆی» هەر لەسەر هەمان سروشتی خۆی بەردەوام دەبێت. بەگشتی سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کوردی بەبێ کاریگەری مۆدێرنە تا ئەندازەیەک ناموکین دەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم

ڕستەیە بەجۆرێک گشتییە شتێکی ئەوتۆ کۆنکرێتمان لەسەر کارلێکە ناوەکییەکانی مێژووی ئێمە بۆ ڕوون ناکاتەوە. بۆیە لە ڕاستیدا کارێکی تیوری گەورەمان پێویستە بۆئەوەی پەیوەندی مۆدێرنە و ناسیونالیزمی کوردی بخوێنینەوە. من وادەبینم کە ئەم پەیوەندییە یەکسەرە و یەک ڕوو و یەک ئاراستە نییە، پەیوەندییەکی ئاڵۆزە کە بەسەرێک بزاوتی ناسیونالیزمی کوردی لە ناوەوە هەلاهەلاکردوە، بەسەرێکی دیش ساڵگەلێکی زۆر پرۆسەی مۆدێرنیزەکردنی عەقڵی کوردی بردۆتە دواوە. بە کورتی پەیوەندییەکە زۆر گرفتئامێزە. مۆدێرنە یەک خەونی سەرەکی دەبەخشێتە ناسیونالیزمی کوردی کە خەونی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی و وێنەی یەکانگیر و جەستەی یەکگرتووی نەتەوەیە. دوای هەرەسی ئیمپراتۆرییەتە گەورەکان و سەرهەڵدانی بزاوتە دەستوورییەکان، لە زۆر پنت و دەڤەری خۆرهەڵاتدا، پرۆسەی خۆپێناسەکردنی نەتەوەیی لای عەرەبەکان و تورکەکان و فارسەکان بە بەبەربڵاوی دەست پێدەکات. ئەم پرۆسەیە لە کاتێکی مێژوویدا ڕوودەدات کە کۆمەڵگای کوردی تەواو ئامادەنییە بۆی، هێشتا شوناسە بچوکەکان زۆر بەهێزن، هێشتا خێڵ و عەشرەت پێکهێنی سەرەکین، هێشتا شارە کوردییەکان شاری ڕاستەقینەنین، هێشتا نوخبەی خوێندەواری مەدەنی کورد زۆر بچوک و لاوازە. بە بڕوای من ئەم کێشەیە لەسەرەتاکانی سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کوردیدا ڕۆڵێکی مێژوویی گرنگ لە نوشستەکانی دواتری ئەم بزاوتەدا دەبینێت. واتە گەر لەسەر ئاستی ناوچەکە سەیربکەین گەشەیەکی ناهاوسەنگ و ناهاویەک لە نێوان ستراکتوری ناسیونالیستییەکاندا دەبینین. بۆ نمونە گەر بەراوردێک لە نێوان ناسیونالیزمی کوردی و تورکی یان کوردی و عەرەبیدا بکەیت، تەواو ئەو جیاوازییە جەوهەرییانە دەبینیت کە وایانکردوە ناسیونالیزمی کوردی ناسیونالیزمێک بێت هیچ کات بەرچاوی ڕوون نەبێت، لەشێکی یەکگرتووی نەبێت، پرۆژەیەکی

سەرتاسەری نەبێت. ناسیونالیزمی تورکی لەسەر ئێسک و پروسکی ئیدارەیەکی ئیمپراتۆری گەورە هەڵدەستێتە سەرپێ، ناسیونالیزمێکی بریندارە کە هەستی دینی و نەتەوەیی تا دوا پلە بریندار بووە، دوا جێگا تێیدا بەرگری لە ئابڕوی نەتەوەیی خۆی بکات، شکاندنی ئەو نەتەوە لاواز و بێدیفاعانەیە کە دەکەونە سەر دوا سنووری نێوان قەڵەمڕەوی خۆی و جیهانەوە. قڕانی ئەرمەنەکان و سەرکووتکردنی دڕندانەی کورد لە تورکیا پەیوەندی بەو دۆخە هیستیرییەوە هەیە کە تورکەکان دوای هەرەسی ئیمپراتۆرییەتەکەیان تووشی دێن، ناسیونالیزمی تورکی دێتە سەر میراتی ئیداری و سەربازی و کولتووری ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە، کە بە ناسیونالیزمێکی ساوا و پارچەپارچە و بێمێژووی وەک ناسیونالیزمی کوردی بەراورد ناکرێت. لێرەوە تورکەکان لە ڕێگای تۆمارکردنی سەرکەوتنێکی وەهمی بەسەر کورددا دەیانەوێت ئەو شکستە دەروونییەی خۆیان تێپەڕێنن، گەر بەوردی بڕوانین ئەو دڕندەیی و ئینکارکردنە ناماقووڵەی ناسیونالیزمی تورکی بۆ کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆخەی کە «سەرکەوتن بەسەر کورد» دا وەک تاکە قەرەبووی ئەو نوشوستە مێژووییە دەمێنێتەوە کە تورکەکان لەسەر ئاستی جیهانیدا پیایدا تێپەڕین، هەر سەرکەوتنێکی کوردی لە ئەستی تورکیدا برینێکی قووڵ دروستدەکات، چونکە وەک درێژکراوەی ئەو زنجیرە شکستە مێژووییە دەردەکەوێت کە تورکەکان لەسەرەتاکانی سەدەی بیستدا ڕووبەڕووی بوونەوە، لێرەوە پەیوەندی نێوان ناسیونالیزمی تورکی و کورد پەیوەندییەکی عوسابییە. واتە سەرکەوتن بەسەر کوردا تاکە ڕەگەز بووە هاوسەنگی سایکۆلۆژی ناسیونالیزمی تورکی ڕاگرتووە، تاکە شانازی و دوا شانازی ئەم ناسیونالیزمە بووە، دوا بەرگری نەرسیسییەتی «خودنەڤینی» ئەم ناسیونالیزمەش بووە لە خۆی ... بەرامبەر بەمجۆرە لە ناسیونالیزم، ناسیونالیزمی کوردی بوویەکی لاواز بووە ... بەبڕوای من

ناسیونالیزمی کوردی لە ژێر فشاری ناسیونالیزمەکانی دیکە و لە ژێر کاریگەری ئەو خەونانەدا گەورە دەبێت کە خەونی مۆدێرنەن و نوخبەی خوێندەواری کورد لە خەیاڵی دەستەجەمعیماندا دەیچێنێت. لێرەوە لەپاڵ هەموو شۆڕشەکانی کوردیشدا ناسیونالیزمی کوردی، ناسیونالیزمێکی پاسیڤە، پتر لەسەر «ترس لە نەمان» دروستبووە نەوەک لەسەر «ئارەزوو بۆ قودرەت». ناسیونالیزمی کوردی لە بەرئەوەی لە بنەڕەتدا پێش وەرزی خۆی لەدایکبووە، منداڵێکی ناکامڵە، لە هیچ قۆناغێکی مێژووی خۆیدا بەرزنەبۆتەوە بۆ ئاستی ئەو خەونانەی کە مۆدێرنە پێیدەبەخشێت. ڕاستە ناسیونالیزمی کوردی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەری مۆدێرنەدا گەورەدەبێت، بەڵام هەمیشە لە ڕاکردنێکی بەردەوامیشدایە لە مۆدێرنە، چونکە ناتوانێت ئەو خەونانە وەربگێڕێتە سەر زمانی سیاسی.

شاعیرانی کورد لە حاجییەوە بۆسەر شێرکۆ بێکەس هەوڵێکی گەورەیان داوە ناسیونالیزمێکی پڕ هیوا و خەون دابرێژن، بەڵام ناسیونالیزمی سیاسی ئێمە توانای ئیشکردنی لەسەر ئەو هیوایانە نییە. بە ئەندازەیەک لە هەندێک وێستگەدا دەتوانین بڵێین کە ناسیونالیزمی سیاسی ئێمە هیچ نییە جگە لە پرۆسەی خیانەتکردنی بەردەوام لە خەونەکانی مۆدێرنە، تەعبیرکردنە لە بێهیوایی و بەرجەستەبوونی بێهیوایشە لە فۆرمێکی سیاسیدا. لەبەرئەوە سەیر نییە سیاسەتمەداری کورد زۆر زۆر خێرا دەستبەرداری گووتار و دروشم و گفتی ناسیونالیانە دەبێت. زۆرجار مرۆڤ واهەستدەکات کە ناسیونالیزم نەوەک دینەمۆی سیاسەتی کوردی، بەڵکو بارێکی گەورەیە بەسەر ویژدان و عەقڵی سیاسی کوردەوە، ئاغای جەلال تاڵەبانی لای ئێمە بەرجەستەکەری ئەو ناکۆکییە ویژدانی و ئەخلاقییەیە کە لە نێوان «سیاسەتی کوردی» و «ناسیونالیزم» دا دروستبووە، ئەو نوێنەری گەورەی ئەو فۆرمە

لە ناسیونالیزمە کە دەکرێت بە ناسیونالیزمی پاسیڤ ناویببەین. ناسیونالیزمی پاسیڤ ئەوجۆرە ناسیونالیزمەیە کە لەبری ئەوەی سیاسەت بۆ ئامانجی خۆی بەکاربهێنێت، بەپێچەوانەوە سیاسەت ئەو بۆ ئامانجی خۆی بەکاردەهێنێت. بەکورتی گەرچی ناسیونالیزم تاکە ڕەنگی ناو دونیای سیاسی ئێمەبووە کە هەوڵیداوە وەک دینەمۆیەکی مێژوویی، ببێتە خولقێنەری گووتار و خولقێنەری جۆرە ڕەهەندێکی فیکری، بەڵام هەمیشە ڕەنگێکی کاڵ بووە، بەردەوامیش بەرەو کاڵبوونەوەی زیاتر دەڕوات. باڵادەستی ئاسانی مارکسییەت لە دونیای ئێمەدا نیشانەی لاوازی گووتاری ناسیونالیزمی کوردی بووە، واتە ئەم ناسیونالیزمە هەتا لە قۆناغە هەرە بەهێز و باڵاکانیدا، هەتا لەوپەڕی شکۆی خۆیدا هێزێک هەبووە بتوانێت ئاسان جێگای پێ لەقبکات، ئەمە ئەگەر ئەو ڕاستییە لە بەرچاوبگرین کە لە ڕووی ئینجازی مێژووییەوە، مارکسیزم لە کوردستان گووتارێکی سەد دەر سەد ئەنتی ناسیونالیستی بووە نەوەک گووتارێکی چینایەتی، هۆی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بەرگری نەبووە لە چینێکی دیاریکراو، بەڵکو لەمپەربووە لەبەردەم گەشەی ناسیونالیزمدا، ڕێگریکردن بووە لەوەی ببێتە فیکری ڕەها، کاڵکردنەوەی ڕەنگەکەی بووە. مێژووی سەدەی بیستی کوردی لە جەوهەریدا مێژووی خاوبوونەوەی ئەو گوژمەیە کە سەرەتا مۆدێرنە لەسەر ئاستی فەنتازیدا دەیبەخشێتە ناسیونالیزمی کوردی.

**پرسیار: پێدەچێ مۆدێرنێتە لە ناو تورک و فورس و عەرەبدا وەک پرۆسەیەکی نابەگە و خۆنەگرتوو و ناسروشتی چووبێتە پێشێ. ئاخۆ ئەم ڕەوتە لە ناو کورددا جیاوازییەکی جەوهەری لەگەڵ تورک و عەرەب و فورسدا هەیە؟**

وەڵام: هەست ناکەم فۆرمێکی کامڵ و ئیدیال بۆ مۆدێرنە هەبێت، کۆمەڵگا جیاوازەکان بە شێوەی جیاواز بەر مۆدێرنە دەکەون و پێیدا دەڕۆن، هەروەها پەرچەکرداری جیاوازیشیان بەرابەری هەیە. مۆدێرنە لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک پرسیار و کێشە بۆ کۆمەڵگا خۆرهەڵاتییەکان دەهێنێت. بۆ نمونە پەیوەندی نێوان غەرەبزەدەگی و مۆدێرنە چییە و لە کۆیدایە؟ ئایدلۆژیای ئەتاتورکی هەوڵێکی گەورەیە بۆ ناساندنی مۆدێرنە وەک گواستنەوەی مۆدێلی خۆرئاوایی و پشتکردنە تەواوی شێوازە خۆرهەڵاتییەکانی ژیان، بەڵام هەموو دەزانین کە پرۆژەی ئەتاتورکی و شاهەنشاهیش تووشی نوشوستی گەورەبوون. ئەمرۆ لە «کەنداوی عەرەب» هەوڵدەدەن جۆرە مۆدێرنەیەک دابرێژن مۆدێرنیزەکردنی ژیانی مادی تێیدا لە مۆدێرنیزەکردنی ژیانی رۆحی دابڕابێت. ئێمە لە خۆرهەڵات بە گشتی مۆدێرنە وەک پرۆسەیەکی یەکانگیر و گشتی سەیر ناکەین، بەرخوردی یەکەمی ئێمە لەگەڵ مۆدێرنەدا پارچە پارچەکردنێتی، بۆ نمونە وەرگرتنی دەستکەوتەکانی مۆدێرنە لە بواری تەکنۆلۆژیا و کیمیا و فیزیک و زانستە سروشتییەکاندا گرفتێکی ئەوتۆ دروست ناکات، هەتا موحافەزەتکارەکانیش کێشەیان لەوەدەستخستنی زانست و تەکنۆلۆژیای مۆدێرندا نییە، بەڵام ئەوەی لە خۆرهەڵاتدا کێشەی دروستکردوە دەرەنجامە سیاسی و ئەخلاقی و فیکرییەکانی مۆدێرنەیە. لێرەوە بە ئاسانی دەتوانین تێبگەین کە گرنگی مۆدێرنە لە رووکارە زانستییەکەیدا نییە، بەڵکو لە رووکارە فەلسەفی و ئەخلاقی و سیاسییەکەیدایە. دیارە ئەم پارچەپارچەکردنەی مۆدێرنە، دەرەنجامی ترسناکی لەسەر ستراکتوری کۆمەڵایەتی هەیە، قووتدانی نیوەی مۆدێرنە و قووتنەدانی نیوەکەی دیکەی هۆیەکی سەرەکییە بۆ قووڵبوونەوەی ناکۆکییەکانی ناو دونیای ئێمە. ریشەکانی ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سییەکان، لەسەرەتای سییەکانەوە تا کۆتایی

هەفتاکان پرۆژەی سۆسیالیزم دەبێتە تاکە هەڵگری خەونی گۆڕان و مۆدێرنە. بزاوتی سوسیالیزم تەواو ڕووەکانی دیکەی مۆدێرنە لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەکوژێت و کورتیدەکاتەوە بۆ پرۆژەیەکی سیاسی و حیزبی و دەسەڵاتخواز. لێرەدا شوێنی ئەوە نییە کە ئەو کێشەیە بە وردی بخوێنینەوە، بەڵام بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان و لە بەر ژمارەیەکی ئێجگار زۆری هۆکار، پرۆژەی سۆسیالیستی و مارکسی بووە ناڕاستەوخۆ بووە مۆنۆپۆڵکەری خەونی مۆدێرنە و پوچەڵکەرەوەی ئەو خەونەش. دیارە لە ناو ئەم پاشەکشێ گەورەیەی خەونی مۆدێرنەدا، لکە گەشە هەبووە، بۆ نمونە لە سەرجەمی خۆرهەڵاتدا مۆدێرنیزەکردنی ئەدەبی و فیکری هەنگاوی گەورەی بەرەو پێش ناوە، کەم تا زۆر لە ناوەندی ڕۆشنبیراندا نوخبەیەکی نوێگەر دروستبووە، کە ناتوانێت خەونە فیکرییەکانی خۆی وەربگێڕێتە سەر زمانی سیاسی، ئەمە جیاوازی نێوان خەون و واقیعی لە دونیای ئێمەدا بەجۆرێکی سەیر گەورەکردوە. پێموایە کێشەی هەرە گەورە دواجار لەوەدایە کە پرۆژەی مۆدێرنە لە خۆرهەڵات ئیدیالێکی نییە چاوی لێبکەین... واتە لە هیچ جێگایەکدا بە ڕاستی سەرنەکەوتووە. مۆدێرنە یان ڕاستتروایە بڵێین خەونی مۆدێرنە لە ئاستی کوردیدا ، هەمان ئەو کێشانەی هەبووە کە پرۆژەی مۆدێرنیزەکردن لە هەموو ناوچەکەدا هەیەتی، بەڵام بە حوکمی کۆمەڵێک هۆکار ئێمە هەندێک لەو کێشانەمان نەبووە، بەڵام هەندێکی تر لەو کێشانە لای ئێمە بەرجەستەتر و بەرچاوتر و زەقتر دەردەکەون. بۆ نمونە مۆدێرنیزەکردنی هەیکەلییەتی ئیدارە و دەوڵەت لای تورک و فارس و عەرەب، بەشێکی هەرە گرنگی خەونی مۆدێرنەبووە، بەڵام ئێمە لە پەراوێزی ئەو خەونەدا ژیاوین، بەپێچەوانەوە ئەو ڕەشەکوژی و قەتل و عامە گەورانەی ئێمە لەسەدەی بیستدا ڕووبەڕوویدەبینەوە دەرەنجامی خەونی دەوڵەتی مۆدێرن و داڕشتنی مۆدێلی دەوڵەت ـــ

نەتەوەیە کە لە هەر یەک لە تورکیا و عێراق و ئێران باڵادەستدەبێت. جیاوازی سەرەکی نێوان خەونی کوردی بۆ مۆدێرنە و خەونەکانی دی لە دوای هەرەسی سوسیالیزمەوە دەستپێدەکات. تا کۆتایی هەفتاکان سوسیالیزم ئەو خاڵە هاوبەشە بوو کە دەیتوانی شێوە گووتارێکی هاوبەش لە نێوان نەتەوە جیاوازەکانی خۆرهەڵاتدا دروستبکات، بەڵام دوای هەرەسی سوسیالیزم، گەڕانەوە بۆ ڕابوردووی دینی و نەتەوەیی بووە هێزی سەرەکی بۆ دروستکردنی شوناس. لەگەڵ ڕوخانی شا و داگیرکردنی ئەفگانستان و دەستپێکردنی شەڕی عێراق و ئێراندا ، گەلانی ناوچەکە بە پرۆسەیەکی گەڕانەوەی قووڵدا بۆ شوناسی دێرین دەڕۆن، وەک ئەوەی خۆرهەڵات جگە لە ڕابوردوو شوێنی دیکەی نەبێت بەرەو ڕووی بڕوات. بەڵام ئێمەی کورد ڕابوردوویەکی شکۆدارمان نییە بۆی بگەڕێینەوە، ئێمە جگە لەوەی کە دەبێت سەیری پێشەوە بکەین چارێکی دیکەمان نییە... مەسەلەکە ئەوە نییە کە ئێمە ڕابوردوومان نییە، بەڵکو ئەوەیە کە ئێمە تەواو لەو ڕابوردووە دەرکراوین، واتە ڕابوردووی دینی و ئیسلامی بە ئەندازەیەک لەلایەن عەرەب و تورک و ئێرانییەکانەوە ناسیونالیزەکراوە، ئێمە هەتا گەر باس لە موڵکداریتی بەشێکی ئەو ڕابوردووەش بکەین هیچ دەلالەتێکی تایبەتی ناگەیێنێت و شتێکی پۆزەتیف و کۆنکرێت نادات بەدەستەوە، واتە نابێت بە سەرەپردێکی هاوبەش و خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئێمە و هەموو گەلانی ناوچەکەدا. پرۆسەی ناسیونالیزەکردنی ڕابوردوو بە ئەندازەیەک لای تورک و عەرەبەکان و فارسەکان گەورەیە دەرگای لەبەردەم داڕشتنی گووتارێکی ترادسیۆنی و دینی کوردیدا داخستووە. بۆیە هەتا هێزە دینییەکانیش لە کوردستاندا ناتوانن بەبێ ئاوازی ناسیونالیستی بژین و بخوێنن. جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان ناسیونالیزمی کوردی و ناسیونالیزمی ناوچەکەدا بەرچاوبێت، ئەوەیە کە لای گەلانی ناوچەکە

هەردوو گووتاری دینی و ناسیونالیستی زۆر پاڵپشتی یەکتریدەکەن، یەک یەکتر بەرهەمدەهێننەوە، بەجۆرێکی راستەوخۆش رێگری لەدەرکەوتنی رووە دیموکراسەکانی مۆدێرنە دەکەن. بەڵام ناسیونالیزمی کوردی ناتوانێت ئەو کۆمەک و پشت ئەستوورییە لە دین وەربگرێت. چونکە ناکرێت ئیدیعای خاوەندارێتی رابوردوویەک بکەیت، کە بە ناوی ئەو رابوردووەوە، بە هۆی گەرانەوەی تارمایی ئەو رابوردووەوە تۆ بێماف دەکرێیت و سەرکووت دەکرێیت. هێزە ئاینییەکانی کوردستان بۆ دەرچوون لەو قەیرانە هەوڵی پیادەکردنەوەی هەمان مۆدێلی تورکی، عەرەبی، ئێرانی دەدەن، واتە هەوڵی موتوربەکردنەوەی ئاین بە ناسیونالیزم، بەڵام ئەم موتوربەکردنە هێندەی ئەو جەوهەرە ناکۆکە بەرجەستەدەکات کە خودی ئەم بزاوتانەی لەسەر دروستبووە، کێشە سیاسی و مێژووییە راستەقینەکان چارەناکات. لەلای تورک و عەرەب و ئێرانییەکان گووتاری دینی بووە رزگارکەر و فریادرەسی گووتاری ناسیونالی. بەڵام لای ئێمە دارشتنی پەیوەندییەکی سیاسی پتەو لە نێوان ئەم دوو گووتارەدا لاواز و بێزەمینەیە. ئەوەی ئێمە نەتەوەیەکی موسڵمانین بەجۆرێکی ئۆتۆماتیکی نابێتە زەمینە بۆئەوەی گووتاری سیاسی هاوچەرخ بتوانێت ئەو پاشخانە وەربگێرێتە زمانێکی سیاسی کاریگەر. هەندێک دەیانەوێت بڵێن کە شکۆی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و سەفەویی و عوسمانی، شکۆی ئێمەشە، ئەمە تێزێکە لە ویژدانی مرۆڤی ئێمەدا ریشەیەکی راستەقینەی نییە. لێرەوە لە ناو پرۆسەی گەرانەوەدا بۆ رابوردوو کە خۆرهەڵات پێیدا دەروات جێگایەک بۆ خەون و شوناسی ئێمە نییە. ئەوانی دی بەدوای شکۆی خۆیاندا بۆ رابوردوو دەگەرێنەوە، بەڵام ئێمە دەبێت لە شکستی رابوردووش هەڵبێین، ئەمەیە وادەکات کە جگە لە روانین بۆ پێشەوە ئەگەری دیکەمان لەبەردەمدا نەبێت.

**پرسیار: ئایا واهەیە مۆدێرنێتەی کوردی بەشێوەیەکی هێزەکی (بالقوة) کۆمەڵێک پۆتانسیالییەت و لێهاتووییەکی لە خۆیدا حەشاردا بێت، بەچەشنێک ئەو پۆتانسیالانە لە ڕەوتی بە مۆدێرنەبوونی نەتەوە هاوسێکاندا نەبێت.**

وەڵام: باسکال لە جێگایەکدا باس لە دیاردەیەک دەکات ناویدەنێت «ئیمانی پێش ئیمان». بۆئەوەی لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا لە مۆدێرنە بگەین، دەبێت بۆ چوارچێوەیەک بگەڕێین کە دەتوانم بە «مۆدێرنەی پێش مۆدێرنە» ناویبنێم. مەبەستم ئەو چوارچێوەیەیە کە مۆدێرنە دەتوانێت ئیشی تێدا بکات. لەو باوەڕەدام بوونی چوارچێوەیەکی مۆدێرن بۆ مۆدێرنە هەندێجار لە بوونی خودی مۆدێرنە گرنگترە. بەڵام ئەم بابەتە تەوەرێکی ئێجگار قووڵە کە زەحمەتە بتوانین لێرەدا بەتەواوەتی تاوتوێیبکەین. بەگشتی پێموایە هەموو پرۆسەیەکی مۆدێرنیزەکردن لە فەزایەکی مێژوویی و عەقڵی و کولتووری تایبەتدا لە دایکدەبێت. بەڵام بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە دەبێت کەمێک تیشک بخەمە سەر ڕەهەندێکی گرنگی ناسیونالیزمی کوردی کە گرنگە بۆ تێگەیشتن لە تەواوی بۆچوونەکەم. ئێمە بەدرێژایی مێژوو میللەتێکی بێدەوڵەت بووین، واتە دەوڵەت پایەی سەرەکی مانەوە و خۆگری ئێمە نییە. ئەمە نیشانەیەکی گەورەیە کە دەیسەلمێنێت، نەتەوەیەک بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، مەرج نییە فۆرمی دەوڵەت بتوانێت بیپارێزێت، یا دەکرێت بڵێم فۆرمی دەوڵەت تەنیا قەڵغانی نەتەوە نییە. بەر لە هەر شتێک هەستکردن بە جیاوازی و شوناس نەتەوە دەپارێزێت. بەبڕوای من نەتەوەیەک بتوانێت لەسەردەمی کۆلۆنیالیزم و پۆست کۆلۆنیالیزمدا بەبێ دەوڵەت بمێنێتەوە و گەشە بە کولتوور و فەرهەنگی خۆی بدات، واتە نەتەوەیەکی لاواز نییە. ئەوەی لێرەدا لاوازە و ناتوانێت ئەو هێزە پۆتێنسیالە بکات بە

هێزی ڕاستەقینە، ناسیونالیزمی کوردییە وەک ئایدۆلۆژیا نەوەک کورد وەک نەتەوە. من سەر بە هەڵگرانی ئەو تیورەیە نیم کە دەڵێن لەدایک نەبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی کورد، هۆکەی نوقستانییەکی بونیادی کۆمەڵگای کوردی خۆیەتی، دەوڵەتی کوردی دروست نەبووە، چونکە لە بنەڕەتدا ناسیونالیزمی کوردیێ لەسەر بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی دروست نەبووە. جەوهەری ناسیونالیزمی کورد لەسەر گووتاری دامەزراندنی دەوڵەت دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر گووتاری خۆپاراستن دامەزراوە، واتە لەسەر گووتاری مانەوە. ئەو گووتارەی من بڕێکی زۆر ئیشی تیوری خۆم بۆ ناساندنی و ڕەخنەکردنی تەرخانکردوە. ئەمە سەرەکیترین سیفەتی ناسیونالیزمی کوردە بەرابەر ناسیونالیزمەکانی دیکە. لە کۆنەوە تا ئەمرۆ مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی وەک خەونێکی دوور سەیرکراوە. ناسیونالیزمی کوردی بە پێچەوانەی ئەو وێنە تەقلیدییەی کە خۆی و نەیارانیشی بانگەشەی بۆدەکەن، ناسیونالیزمێکە جەوهەری لەسەر گۆڕینی دەوڵەت بۆ بیرۆکەیەکی خەیاڵی دروست بووە. هەموو بونیادی سیاسی تەقلیدی کوردی هێزی خۆی لەو خەونەوە وەردەگرێت. بەوەدا خەونەکە ئەبەدییە، کەواتە ئەو بونیاد و ئەکتەر و بکەرانەی نوێنەرایەتی ئەو خەونەدەکەن دەبێت ئەبەدیبن. ناسیونالیزمی کوردی لە ڕێگای هاتنەدی خەونەکەوە درێژە بەخۆی نادات، بەڵکو لە ڕێگای نەهاتنەدییەوە، لە ڕێگای گۆڕینی خەونەکەوە بۆ واقیع بەردەوامی خۆی تۆمارناکات، بەڵکو لە ڕێگای هێشتنەوەی خەونەکەوە وەک خەون. لێرەوە هۆکاری پاسیڤییەتی حیزبە کوردییەکان دەرهەق بە مەسەلەی دەوڵەت لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا بە ئاشکرا ڕووندەبێتەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سالآنی حەفتا و هەشتا کاتێک گووتاری مارکسیستی، بە تۆنە ئەنتی ناسیونالیستییەکەیەوە بەسەر ناسیونالیزمی

کوردیدا زاڵبوو، ئاسان بۆمان ڕووندەبێتەوە کە جێبوونەوەی مارکسیزم لە ناو گووتاری ناسیونالیستی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕەهەندی دژایەتی بیرۆکەی دەوڵەتی ناسیونالی لە ناو ناسیونالیزمی کوردی خۆیدا. تێزی ئەنتی دەوڵەتی مارکسیستی، بە ڕەزامەندی نهێنی و نەستئارای ناسیونالیزمی کوردی خۆی پیادەبوو. نەفیکردنی بیرۆکەی دەوڵەت لە هەستی کوردیدا هەرگیز بەر بەربەستێکی ڕاستەقینە نەکەوتووە، شتێکی گەورە و تێزێکی دژ نەبووە ڕێگای پێبگرێت، هەربۆیە کە سەرۆکەکانی کورد بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی وەک خەونی چۆلەکە وێنادەکەن، هیچ هێزێک و گووتارێکی ڕاستەقینە نییە بەر بەم وێناکردنە بگرێت.

پرسیارەکە ئەوەیە کە ئەم هاوکێشەیە لە قۆناغی داهاتوودا چۆن دەچێتە پێشێ. ئێستا ئاسۆکان بەرەو ئەوە دەجوڵێن بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ گەلانی وەک کورد ئەو سیما ترسناکەی جارانی نەمابێت. جاران بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمدا مانایەکی شۆڕشگێڕانەی دژ بە هەیمەنەی ئیمپریالیستی هەبوو، دواتر مۆدێلی «دەوڵەت ـ نەتەوە» لەسەردەمی پۆست کۆلۆنیالیدا بەرابەر نەتەوە بچوک و شوناسە ئەتنییەکان سروشتێکی فاشی و توێنەرەوەی وەرگرت، کە لەسەر ئەسیمیلەکردن و جینۆساید بەندبوو. ئێستا لەسەردەمی گلۆباڵدا ئەم ڕەهەندە جیاوازانەی دەوڵەتی نەتەوەیی بەرەو کزی دەڕوات، دیارە ماوەیەکی مێژوویی دوورودرێژمان دەوێت بۆئەوەی تێبگەین ئەم پرۆسەیە بەرەو کوێ دەڕوات و چەشن و شێوە جیاوازەکانی چۆن دەکەونەوە، بەڵام بە گشتی خواستی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی و ترسیش لە دەوڵەتی نەتەوەیی هێدی هێدی بەرەو کزبوون دەچن، ئەم کزبوونە لە هەموو ئاست و جێگاکاندا وەک یەک نییە، بەڵام لە مۆدێلی گلۆباڵدا بازاڕ لە خولیای ئەوەدایە فشاری سیاسەت لەسەر ئابووری کەمتربکاتەوە، ناسیونالیزمی توندڕەو ڕێگرێکی ئابووری ترسناک لەبەردەم

گەشە و کرانەوەدا دروستدەکات، ئەمە وادەکات لە هەناوی کۆمەڵگاکاندا ئاڕاستەیەکی ئەنتی ـ ناسیونالیستی گرنگ دروستببێت، بەتایبەت چینە ئابورییە باڵاکان سوودێک لەو توندرەوییە ناسیونالیستییە نابینن. گەر تەماشابکەیت ناسیونالیزمی عەرەبی و تورکی و ئێرانی تۆزێک سەختتر لاوازبوونی سەنتەری دەوڵەتی ناسیونالیان پێ قەبووڵدەکرێت. ئەمە ئەو خاڵەیە کە جیاوازی پۆتێنسیالییەت لە نێوان ناسیونالیزمی کوردی و ناسیونالیزمەکانی دراوسێدا بەرجەستەدەکات. ناسیونالیزمی کوردی نەگۆڕی مێژوویی و پرەنسیپی چەسپیو و چوارچێوەی ئایدۆلۆژی ڕۆشنی نییە، ئەمە هەم خاڵی لاواز و هەم خاڵی بەهێزی ئەم ناسیونالیزمەیە. خاڵی لاوازیتی چونکە چیتر لە ناوەوە ناتوانێت ئاسان بۆ یەکێتی نەتەوەیی و بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی ئیشبکات، هەم خاڵی بەهێزیشێتی چونکە ڕەهەندی دۆگمائی لە ناو ئەم ناسیونالیزمەدا لاوازدەکات. ئێمە لە کوردستانی عێراق هێز و بێهێزیمان لەو سیفەتەوە سەریهەڵداوە، جۆرە ناسیونالیزمێکی خۆژێنمان هەیە، ناسیونالیزمێک کە تاپلەی هەلپەرستی خۆگونجێنە، ئەمە وایکردوە ئەم ناسیونالیزمە زوو بتوانێت فۆرم و شێواز و دروشمەکانی خۆی بگۆڕێت بێئەوەی تووشی هیچ جۆرە شۆکێکی ئایدۆلۆژی ببێت، ئەمڕۆ کوردستانی تورکیاش بە هەمان پرۆسەدا دەڕوات، پرۆسەی خۆتەکاندن لە هەموو ئامانجێکی نەگۆڕ. بەلام ئەم سیفەتە لە ناوەوەڕا ناسیونالیزمی کوردی تووشی ڕۆحێکی ناوچەگەرا و دەڤەرچی کردوە. ئێستا ناسیونالیزمی کوردی وەرگەڕاوەتە سەر بزاڤێکی دەڤەرگەرا کە هەندێک خەڵکی دەڤەرچی سەرکردایەتیدەکەن. پۆتێنسیالییەتی ناسیونالیزمی کوردی لەوەدا دەبینمەوە کە لە داهاتوودا ئاسانتر دەتوانێت کێشەکانی لەگەڵ دونیای دەرەوەدا چارەبکات، لەوەی بتوانێت بەسەر کێشە ناوخۆیی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردیدا زاڵبێت، بۆیە هیچ چارێک لە

بەردەم ئەم ناسیونالیزمەدا نییە ئەوە نەبێت کە کێشە ناوخۆییەکانی خۆی لە ڕوانگەی عەقڵی و فیکرییەوە ببینێت و هەوڵبدات لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ سیاسەت. توانای خۆگونجاندن لەگەڵ ڕەوتی گڵۆباڵدا مانای نییە گەر لەناوخۆدا بۆ جۆرە ئیجماعێکی نیشتیمانی دامەزراو لەسەر ڕێزی جیاوازی نەگەڕێین. لاوازبوونی تێزی دەوڵەتی نەتەوە مەرج نییە ئۆتۆماتیکی بە مانای لاوازبوونی بیرۆکەی نەتەوە تەواوبێت، چونکە لاوازبوونی بیرۆکەی نەتەوە بۆ گەلانی وەک ئێمە مانای گەڕانەوە و کەوتن و دابەزین بۆ لکەشوناسە بچوکەکان، بۆ شوناسی خێڵ و شار و دەڤەر، کە لەگەڵ خۆیدا بڕێکی زۆر لە نائارامی کۆمەڵایەتی دەهێنێت. بە کورتی پۆتێنسیالییەتی ناسیونالیزمی کوردی لەوەدایە کە دەتوانێت زۆر ئاسانتر لە ناسیونالیزمەکانی تر شێوە و دروشمی خۆی بگۆڕێت، ئەمە کارئاسانییەکی گەورەیە گەر بێت و بەراوردیبکەین بەو ناسیونالیزمە دۆگمائییە داخراوانەی کە لە ناوچەکەدا هەن. ئەو توانای خۆگۆڕینە سوودەکانی لە کوردستانی تورکیا بەزەقی دیارن، ناسیونالیزمی تورکی هێند ڕەق و دۆگمائییە، ئێستا لە ناو وێنەکەدا وەک ناسیونالیزمێکی شکستخواردوو دەردەکەوێت، چونکە سەدەیەکە ئەم ناسیونالیزمە دۆگما و داخران و ڕق بەرهەمدەهێنێت، بەرابەر بەوە ناسیونالیزمی لاوازی کوردی بە هێزی خۆژێن و خۆگونجێن و تەکتیکە سەرەتاییەکانی هەنگاوی گرنگ بۆ پێشەوە تۆماردەکات. گرنگە ئەو پۆتێنسیالییەتە بەجۆرێک بەکاربهێنین نەچێتە بەر ڕێگایەکی بونبەست وەک ئەمڕۆ لە کوردستانی عێراق دەیبینین. ناسیونالیستە کوردەکانی عێراق زیانی کوشندەیان لە مۆراڵی بزاوتی ناسونالی کوردی دا کاتێک بوونە لاساییکەرەوەیەکی مۆراڵی ناسیونالیستە باڵادەستەکان، کاتێک لەگەڵ ئەواندا تەماهیانکرد، بەڵام ئەمەیان خاڵێکە پێشتر زۆر لەسەری دواوم و پێویست ناکات لێرەدا دووبارە جەختی لەسەر بکەمەوە.

**پرسیار : ریچارد ڕۆرتی لە مەڕ دامەزراندنی سیستمی دیموکراسی لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکاندا بۆچوونێکی بەنێوبانگی هەیە، ئەو دەڵێ فەلسەفە بە گشتی و ئەو ڕەوتە فیکرییانەی لە جیهانی ڕۆژئاوادا بوون بە ڕێگەخۆشکەری دامەزرانی سیستمی دیموکراسی، ئێستا لە وڵاتەکانی جیهانی سێهەمدا ئەگەر نەشناسرێن و بەوردیش شی نەکرێنەوە، دیسان دەکرێ لەم وڵاتانەدا دیموکراسی وەکو سیستمێکی دەوڵەتی دابمەزرێ و سەقامگیربێت. بەدەربڕینێکی دیکە فیکر و فەلسەفە وەک نەردیوانێکە کەدوای ئەوەی مرۆڤی گەیاندە بانی دیموکراسی، دەکرێ فڕێبدرێ. ئێستا کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی دیموکراسی ناسیوە و دەکاری کردووە، مرۆڤی ڕۆژهەڵاتیش دەتوانێ بەبێ بڕینی ئەو ڕێگا دوور و درێژەی ڕۆژئاوا لە بواری فیکر و فەلسەفەدا، بگا بە دیموکراسی.**

**من دەمهەوێ بۆ بوارێکی تر بگوازمەوە، ئێستا هەندێک بیرمەند ج لە ڕۆژئاوا و ج لە ڕۆژهەڵات بڕوایان وایە، نەتەوە ڕۆژهەڵاتییەکان بۆ گەیشتن بە مۆدێرنێتە پێویست نییە ڕێک ئەو ڕێگایە بپێون کە نەتەوە ڕۆژئاواییەکان پێوایان. ئێستا ئێمەی ڕۆژهەڵاتی بە موتاڵای وردی ئەو دۆخەی ئەوان پێی گەیشتوون، دەتوانین ئەو ڕێگایەی لە بەرمانە بۆ سەقامگیرکردنی مۆدێرنیتە لە ناو کۆمەڵگاکانماندا کورتتریکەینەوە و زۆر قۆناغی ناپێویست وەلابنێین. بە گشتی ڕای جەنابت لەم بارەیەوە چییە؟ ئایا دەکرێت بە مۆدێرن بوون تاقە ڕێگایەکی سروشتی هەیە ئەویش ئەو ڕێگایەیە کە ڕۆژئاواییەکان پێوایان یان دەکرێ چەندین ڕێگای دروست و سروشتی بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشان بکرێ؟**

وەڵام: وەڵامی ئەم پرسیارە ئێجگار سەختە، سەختییەکەشی لەوەوە دێت کە لەسەر بەرەنجامی پرسیارەکە دەکرێت زۆر شتی گرنگ

بونیادبنێین، کە دەرکەوتەی سیاسی گەورەی لێدەکەوێتەوە. لە خۆرهەڵات گووتارێک هەیە، دەڵێت خۆرئاواییەکان زیاد لە چوار سەدەیان ویستووە تا گەیشتوونەتە ئەم فۆرمەی ئەمڕۆ، لێرەوە دەبێت ئێمەش لە پرۆسەی دیموکراتیزەکردندا پەلەنەکەین. هەڵگرانی ئەم گووتارە زۆربەی کات کەسانی سەر بە هێزە دەسەڵاتدارەکانن، لە پشت ئەم تێزەیەوە دەیانەوێت درێژە بە شێوە سیستمێکی سیاسی دیاریکراو بدەن. کۆمەڵگا خۆرهەڵاتییەکان چیتر کۆمەڵگای سەد ساڵ لەمەوبەر نین تا بەهەمان فۆرمی فەرمانڕەوایی حوکمبکرێن. مۆدێرنە شتێک نییە رووی نەدابێت تا بپرسین ئاخۆ دەبێت ڕووبدات یاخود ڕوونەدات. کێشەی کۆمەڵگاکانی ئێمە لەگەڵ مۆدێرنەدا تەمەنی زیاد لە سەد ساڵە، مێژووی سەد ساڵی ڕابوردووی ئێمە جیانابێتەوە لە مێژووی جیهان و کاریگەرە ڕاستەوخۆ و گەورەکانی ئەو مێژووە، زۆر دوور ناڕۆم گەر بڵێم مێژووی ئەم دەڤەرە شوێنێکی سەنترالی لە مێژووی جیهاندا هەیە. لێرەوە پرسیارەکە ناکرێت ئەوە بێت ئاخۆ ئێمە مۆدێرن بین یان نا؟. مۆدێرنە لێرەیە و ئێمە لە ناویداین... ئەوەی کە هەیە کێشەی ناونان و پێناسەکردنمانە بۆ مۆدێرنە. ئەوەیە ئاخۆ نیوەی مۆدێرنە وەردەگرین یاخود هەمووی. مۆدێرنە پرۆسەیەکی بەردەوامە، واتە هەمیشە بەشێکی لێرەیە و بەشێکی لێرە نییە، بەشێکی تێکەڵ بەسیستمی ژیانی ئێمە بووە و بەشێکی لە شەڕی دەرکەوتن و خۆجێکردنەوەدایە. وەرگرتنی نیوەی مۆدێرنە مانای ئەوە نییە کە مۆدێرن نین، بەڵکو مانای ئەوەی لە ناو دیوە تاریکەکەی مۆدێرنەداین، ئەو دیوەی لە ڕۆژئاوا هیتلەر و ستالینی دروستکردوە، مۆدێرنە هەمیشە ئاژەڵێکی دووسەر و مەخلوقێکی دووڕوو بووە، بەبڕوای من هەمیشەش هەروا دەمێنێتەوە، بچێتە ناو هەر کولتوور و هەر ژینگەیەکەوە، بەو شیزۆفرینیا ناوەکی و لەتبوونە قووڵەی کاراکتەرەوە دەڕوات، کێشەی کۆمەڵگای ئێمە کێشەی مۆدێرنە و نامۆدێرنە نییە،

بەڵکو کێشەی ناو مۆدێرنە خۆیەتی، کێشەی نێوان چەشنێکی مۆدێرنە و چەشنێکی دی مۆدێرنەیە، واتە ململانێیەکی ناوەکی ناو مۆدێرنە خۆیەتی. هەمیشە دەبێت ئەو ڕاستییەمان لەبەرچاوبێت کە ئەنتی مۆدێرنە بەشێکە لە جەستەی مۆدێرنە خۆی، نیوە نێگەتیڤ و سالیبەکەیەتی. بە جۆرێک دەتوانین بڵێین وشەی مۆدێرنە دەلالەتێکی خاڵییە کە لەدەرەنجامی ململانێیەکی کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژییەوە ماناکەی پڕدەبێتەوە، ئەوە ململانێ ئایدۆلۆژییەکانی ناو کۆمەڵگایە کە دەم دوای دەم مانای جیاواز بە مۆدێرنە دەبەخشن، مۆدێرنە وەک مۆدێلێکی ئیدیال بوونی نییە، وەک فۆرمێک و شێوەیەکی تەواوەتی و کۆتایی بوونی نییە، چونکە گەر وەهابێت دەکەوینە ناو ئەو تەڵەیەوە کە کەسانی وەک فۆکۆیاما بۆمان دادەنێن سەبارەت بە کۆتاییهاتنی مێژوو، سەبارەت بە ئەبەدییەتی ئەمڕۆ. لەوە بترازێت ئێمە لە خۆرهەڵاتدا لە دۆخێکدا نین بڵێین کە ڕووبەرێکی دەرەوەی مۆدێرنەین، لە سەد ساڵی ڕابوردوودا شێوەی ژیانی ئێمە گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەر هاتووە، سیستمی خوێندنی ئێمە، سیستمی پزیشکیمان، سیستمی بەندیخانە و سزامان، سیستمی چاوەدێری کۆمەڵایەتیمان، پێکڕا سیستمی نوێن. دین وەزیفەی نوێ و فۆرمی نوێ و ئامانجی نوێی وەرگرتووە، قەزا و دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزیمان شتێکی دییە، سیستمی هاتوچۆ و پەیوەندیکردن سەرلەبەری نوێبۆتەوە، کۆمۆنیکاتسیۆنی مۆدێرن ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانماندا دەبینێت، ژێرخانی پیشەسازی و سیستمی بەرهەمهێنان نوێبوونەوەی ڕادیکالی بەخۆیەوە بینیوە، سیستمی دارایی و دراو بۆتە بەشێکی ئۆرگانی ناو سیستمی جیهانی، حیزب وەک فۆرمێکی دروستکەر بۆ شوناس ڕۆڵێکی گرنگ لە دونیای ئێمەدا دەبینێت، میدیای مۆدێرن بووە بەبەشێکی گرنگ و دانەبڕاوی ژیانمان. نەوەک هەر ئەمانە، بەڵکو سروشتی هەڵسوکەوت و خواردن و خواردنەوەشمان گۆڕاوە، هەتا شێوازی

سەیرکردنمان بۆ جوانی، شێوازی نوسین و فۆرمی تەعبیرکردنمان، سروشتی مومارەسەکردنی سێکس و ڕۆڵی سێکس لە خەیاڵماندا گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەرداهاتووە، هەتا خەونەکانمان گۆڕاوە، واتە چیتر نەستی مرۆڤی خۆرهەڵاتی هەمان ئەو نەستە نییە کە سەد ساڵ لە مەوبەر هەبوو، ئێمە ئێستا بە نەستێکی دیکەوە دەژین کە ڕەمزی نوێ، وشەی نوێ، دالی نوێ لە ناویدا ئیشدەکات. دوای ئەم هەموو گۆڕانکارییە یەکێک بێت و بڵێت ئێمە لەدەرەوەی مۆدێرنەین مانای هیچ نابینێت. کێشەکە کێشەی ترادسیۆن و مۆدێرنە نییە وەک هەندێک لە بیرمەندە عەرەب و فارسەکان دەیبینن، بەڵکو کێشەکە کێشەی ناو مۆدێرنە خۆیەتی، کێشەی دیوە ترادسیۆنیست و کۆنزەرڤاتیڤ و فاشییەکەی ناو مۆدێرنەیە لەگەڵ دیوە مرۆڤدۆست و ئازادیخوازەکەی ناو مۆدێرنە خۆیدا. مۆدێرنە دیاردەیەکی سەرتاپاگیرە، هێزێک نییە بتوانێت بە ڕەهایی لەدەرەوەی مۆدێرنە بژی، دەتوانیت بە ڕەهایی تەسلیمی نەبیت، بەڵام ناتوانیت بە ڕەهایی لەدەرەوەی بژی. بەڵام لێرەشدا دەبێت وریابین، کەدەڵێم «دەتوانیت بە ڕەهایی تەسلیمی نەبین» نازانم بە وردی ئەو بە «ڕەها تەسلیم نەبوونە چ مانایەکی هەیە». چونکە من پێموایە عەقڵییەتی پێش مۆدێرن «پری مۆدێرنە» تەنیا بە کۆمەکی دیویێکی تایبەتی مۆدێرنە دەتوانێت بوونی هەبێت و بژی و دەربکەوێت، واتە دژایەتی مۆدێرنە هەر تەنها لە ڕێگای مۆدێرنە و بە کۆمەکی مۆدێرنە دەتوانێت کاربکات، واتە هەموو دژایەتییەکی مۆدێرنە پێویستی بە خودی مۆدێرنە هەیە بۆ نمونە تیرۆری ئەلقاعیدە بەسیستمێکی تەواو مۆدێرن کاردەکات کە گەلێک لە سیستمی گروپەکانی دیکەی تاوانی ڕێکخراو مۆدێرنتر و چنراوترە. بە گشتی دەتوانم بڵێم، مۆدێرنە هیچ کات پرۆسەیەکی هارمۆنی و یەک خەتی نەبووە، پرۆسەیەک نییە لە جێگایەکەوە دەست پێبکات و لە جێگایەکدا تەواو بێت،

پرۆسەیەک نییە بکرێت پێوەرێکی گشتی بۆ دابنێین کە بشێت لە هەموو بوارێکی ژیاندا هەمان پێوەربخەینە کار. وەک چۆن پێوەری نوێگەری لە ئەدەبیاتدا وەک پێوەری نوێگەری نییە لە زانستدا، ئاوهاش پێوەرێکی جیهانی بوونی نییە بۆ پێوانەکردنی مۆدێرنە، ئەوەی هەیە شەڕێکی ئەبەدییە لەسەر مانای مۆدێرنە. واتە زۆر ئاساییە ئەوەی لە خودی مۆدێرنەی وەردەگرین لە هەنگاوی داهاتوودا ببێتەوە بە دوژمنی مۆدێرنە. بۆ نمونە زۆر لە سەلەفییەکان دژی ئەو شێوە و فۆرمانەی مۆدێرنە نین کە هاتوون و بوون بە بەشێک لە سیستم، بەڵام دژی ئەو بەشەی مۆدێرنەن کە نەهاتووە و هێشتا دیار نییە. وشەی مۆدێرنە هەر وەک وشەکانی ئازادی و عەدالەت و ئیمان و یەکسانی هەڵگری فرەواتاییە، بۆیە من تەواو کێشەکە لەو گۆشە نیگایەوە نابینم کە ڕیتشارد ڕۆرتی لێوەی دەڕوانێت، کێشەکە ئەوە نییە ئاخۆ ئێمە چ قۆناغێکی مۆدێرنە ببڕین و کامەی نەبڕین، چونکە پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن، پرۆسەیەکە بەوجۆرە قۆناغبەندی ناکرێت، هەر هەوڵێکیش بۆ قۆناغبەندی کردنی دەمانخاتە ئامێزی تێزکارییەکی ئایدۆلۆژی ترسناکەوە. لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا شەڕ لەسەر ئەوە نییە کە ئایا تەکنۆلۆژیای مۆدێرن، زانستی مۆدێرن، کۆمۆنیکاسیۆنی مۆدێرن، دەرمانسازی مۆدێرن بەکاربهێنین یاخود نا، کێشەکە لەسەر مانای فەلسەفی و کولتووری و سیاسی مۆدێرنەیە، واتە لەسەر چۆنێتی دروستکردنەوەی مۆدێرنەیە لە ناوەوە. مۆدێرنە ئەو شتە نییە کە لەدوامانەوەیە، بەڵکو هەمیشە ئەو شتەیە کە لە پێش دەممانداییە، ئێمە دەیسازێنین و کەتالۆگێکی ئامادەشمان نییە بۆ ئەو کارە. مۆدێرنە وەک ئامێرێکی پارچە پارچە وەهایە، کە هیچ پارچەیەکی بە تەنیا مانای تەواوی ئامێرەکە و وەزیفەکەی نابەخشێت، ئەوەی مۆدێرنە دەکات بە هێز چۆنێتی گرێدان و لێکدان و کاراکردن و ڕیزبەندیکردنی بەشە جیاوازەکانی ئامێرەکەیە لەگەڵ یەکدا

بەجۆرێک کۆیەکی تازە دروستبکەن. ئەم کێشەیە تا ئەمڕۆ کێشەی خۆرئاوا خۆشیەتی، لەگەڵ هەموو دەرکەوتەیەکی نوێدا، هەموو سیستمەکە دەبێت کەم تا زۆر خۆی ڕێکبخاتەوە. مۆدێرنە کێشەیەکی بێکۆتاییە کە لە هەموو چرکەساتێکدا و هەر کۆمەڵگایە و بەپێی سروشتی ململانێ سیاسییەکانی ناوی بەجۆرێکی تایبەتی تێیدا دەژی. لێرەوە هەمیشە زیاد لە مۆدێرنەیەکمان هەیە، چونکە ڕیزبەندیکردن و مانابەخشین بە بەرهەمەکانی مۆدێرنە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دی جیاوازە. هەموو کۆمەڵگایەکی دونیا وەک پۆتێنسیال ئامادەگی مۆدێرن بوونی تێدایە... ئەوەی وادەکات مۆدێرنە فرەڕوو و فرەڕەنگ بێت و لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا دەرکەوتەی جیاواز بخاتەوە، خودی مۆدێرنە نییە بە دەستکەوتە فیکری و زانستییەکانییەوە، بەڵکو سروشت و ماهییەتی ئەو چێوەیەیە کە لە ناویدا مۆدێرنە قەبووڵدەکرێت. «مۆدێرنە پێش مۆدێرنە» ئەو فەنتازیایە کە لە ڕێگایەوە کۆمەڵگا وەزیفە دەبەخشێتە بەرهەمەکانی مۆدێرنە، واتە قەبووڵکردنی مۆدێرنەیە بە مەرجە فەنتازییەکانی خۆمان، بە یارییە ناکۆتا و نەبڕاوەکانی خۆمان. هیچ کاتێکیش ناگەینە سەر فۆرمێک بڵێین ئەمە مۆدێرنە خۆیەتی و ئیدی تەواو. بەم مانایە ئیسلامی سیاسی و ترادسیۆنگەرایی بەشێکی ناو مۆدێرنەن، باڵێکی تایبەتین لە مۆدێرنە، کە لەسەر فەنتازیای موتوربەکردنی ترادسیۆن لە مۆدێرنە ئیشدەکەن... ئایدۆلۆژیای ترادسیۆنی تەنیا لەسەر ڕەتکردنەوەی دەرەنجامە ئەخلاقی و سیاسییەکانی مۆدێرنە دەژی، لەوە بترازێت دەیەوێت چی دەستکەوت و تەکنۆلۆژیایەکی مۆدێرن هەیە دەستیبخات. بۆیە مۆدێرنە لە بازاڕێکی گەورەدەچێت، کە هەر کەسێک دەچێتە ناوی سەبەتەی خۆی بەجۆرە کاڵایەک و گووتارێک و مانایەک پڕدەکات، وەلێ لە ئاستی زەمەنیدا قۆناغبەندیکردن کاری نەکردەیە، وەک ئەوەی ئێمە بڵێین ئاستی گەشەی ئێستای ئێمە بەرابەر

ئاستی گەشەی ئەوروپایە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا، یان لە کۆتاییەکانیدا، یان پێش جەنگی جیهانی یەکەم، یان دوای جەنگی جیهانی دووەم. ئەم لۆژیکە بەبڕوای من زۆر هەڵە و خەندەهێنە، بێمانا و نازانستی و وڕێنەشێوەشە، چونکە جۆرە بەراوردێکی لەو چەشنە نامومکینە... نە هیچ وەدیدەهێنێت و نەهیچ پێشدەخات، گەر زۆر وردیش ببینەوە لە پشتییەوەڕا لۆژیکی گەشەی مارکسیستی خۆی حەشارداوە، نەوەک پرسی مۆدێرنیزەکردنی زیهنی. چونکە ئێستای ئێمە لە خۆرهەڵات، لە ئێستای خۆمان دەچێت و لە ڕابوردووی کەسی تر ناچێت، دیارە دەشێت لێرەو لەوێ لە ڕووی مەجازییەوە هەندێک کاری شوبهاندن بشێت و بگونجێت، بەڵام ئەم جۆرە شوبهاندنە زۆر مەجازی و زۆر ڕێژەدارە کە لە نێوان ئەمڕۆ و ڕابوردووی ئەورووپاشدا هەر شیاوە. شوبهاندنی مەجازی کارێکی ناعەقلانی نییە، بەڵام قۆناغبەندی لەسەر مۆدێلی مۆدێرنەی ئەورووپی هەڵە و نادروستە. بەبڕوای من خودی پرۆسەی قۆناغبەندی بۆ مۆدێرنە هەڵەیە. مۆدێرنە بە پلەی یەکەم پەیوەندی بە شوێنەوە هەیە و بەپلەی دووەم پەیوەندی بە کاتەوە هەیە. مۆدێرنە ماشینێکی گەورە و زەبەلاحە کە لە سەدان ئامێری جۆراوجۆر دروستبووە، ئەم ئامێرە وەک پێکهات و مەتریال لەت لەت دەبێت، بەڵام لە ئاستی زەمەنیدا دروستکردنەوە و ئیشکردنی ئامێرەکان لە هیچ چرکەساتێکی مێژوویدا لەگەڵ چرکەساتێکی مێژوویی تردا تەبانایەتەوە. هەر کۆمەڵگایە و هەر ساتەوەختە بەجۆرێک پارچەکانی ئەم ئامێرە دەنێنەوە بەیەکەوە، بۆیە مۆدێرنە لە هیند و مۆدێرنە لە فینلەندا و مۆدێرنە لە میسر لەگەڵ خاڵە هاوبەشەکانیاندا وەک یەک نین، هەمان فەزای سیاسی و کۆمەڵایەتیش ناخولقێنن. لێرەوە قۆناغبەندییەکی ئیدیال و یەکسەرە و یەک خەتی لە مۆدێرنەدا بوونی نییە، واتە مۆدێلی قۆناغبەندی وەک لە سوسیالیزمدا هەبوو، گواستنەوەی

بـۆ پێوانەکردنـی مۆدێرنـە دروسـت نییـە. هیـچ کۆمەڵگایـەک نییـە لـە قۆناغێکـی دیاریکراودا ئامێرەکـەی بەجۆرێـک بونیادنابێت بشێت ببێت بە مۆدێلـی ئەبـەدی و نەگـۆڕی هەمـوو کۆمەڵـگا و هەمـوو ساتەکان. ئـەوەی مۆدێرنـە سـەرەتا دیاردەیەکـی خۆرئاوایـی بـووە چرکەسـاتێکی کورتـی مێـژووی مۆدێرنەیـە، لـەو سـاتەوەی خۆرئـاوا سـەر لـە ماڵـی خـۆی دەباتـەدەرەوە و لەگـەڵ پەلامارەکانـی خۆیدا گوللـە و بـاروت بـۆ دونیـای دەرەوەی دەکاتـە دیـاری، مۆدێرنـەش لەگـەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و دەیبـات، لـە ڕاسـتیدا ئـەوە خۆرئـاوا نییـە کـە لـە خۆرئـاوا دێتـەدەرێ، بەڵکـو مۆدێرنەیـە کـە خۆرئاوا لـە ماڵـی خـۆی دەباتـەدەرەوە. مۆدێرنـە لـە دونیـای ئێمـەدا سـەرەتا وەک تفەنـگ دێـت، وەک بـاروت و سـاچمە، دواتـر وەک چاپ و چاپخانـە، دواتریش وەک کۆمەڵێـک کەرەسـتە و ئامـرازی سـتراتیژی، وەک زانسـت و زانکـۆ. کۆمەڵـگاکان بەپێـی یاسـای ناوەکـی خۆیـان ئـەو کەرەسـتانە پۆلێـن وڕیـز بەنددەکەنـەوە و نـرخ لەسـەر ماناکان و ئیشـەکانیان دادەنێـن. لێـرەوە کێشـەکە بەبـڕوای مـن ئـەوە نییـە ئایـا ئێمـە سـوود لـە خۆرئـاوا وەربگریـن یـان نـا، لاسـایی ئـەوان بکەینـەوە یاخـود نـا، بەڵکـو ئەوەیـە هەمـوو دیاردەیەکـی مۆدێرنـە لـە جیهانـی ئێمـەدا دەکەوێتـە نـاو فەزایەکـی تایبەتـی ململانێـی ئایدۆلۆژی و فیکرییـەوە کـە لـە دواجـاردا ئـەو فەزایـە سروشـتی سیاسـی ئەوجـۆرە سـوود و زیانـە دەستنیشـاندەکات. بـە کورتـی ئـەوە ئێمەیـن مۆدێرنـە دروسـتدەکەین، نـەوەک ئـەو ئێمـە دروسـتبکات. واتـە ئـەو ماهییـەت بـە ئێمـە نابەخشـێت و ئێمەیـن کـە ماهییـەت بـەو دەبەخشـین. سـەردەمێک سوسـیالیزم وشـەیەکی مۆدێـرن و سـیحری بـوو، هەڵگـری ڕۆحـی مۆدێرنـە بـوو بـۆ کۆمەڵگاکانـی ئێمـە، بـەڵام ئـەم وشـەیە لـە فـەزای کۆمەڵایەتـی و مێـژووی ئێمـەدا مانایەکـی تایبـەت و شـێوەیەکی تایبەتـی وەرگـرت کـە پەیوەنـدی بـە پرۆسـەی ڕیزبەنـدی و پۆلێـن و ماناسـازی نـاو تـەواوی سیسـتمی گووتـارەوە لـە دونیـای ئێمـەدا

هەبوو. پێموایە وشەی سۆسیالیزم لە ڤیتنام یان چین، لە یەمەن یان کۆنگۆ یان لای فەلەستینییەکان هەمیشە شتێکی دی و وێنەیەکی دی و خەونێکی کۆمەڵایەتی جیاوازی بانگهێشتکردوە... سیاقە مێژووییە جیاوازەکان، مانای جیاواز لە یەک وشە دروستدەکەن. من لەو باوەڕەدام هەموو دیاردەیەکی جیهانگیر و یۆنیفرسال تەنیا لە ناوکۆی لۆکاڵ و خۆجێیدا دەشێت تەواو تەفسیربکرێت. کێشەی گەورەی مۆدێرنە ئەوەیە کە وەک یەکەی یەککگرتوو لە هیچ جێگایەکەوە ناگوازرێتەوە بۆ جێگایەکی دی، هەمیشە پارچە پارچە دەگوازرێتەوە، مۆدێرنە دیاردەیەکە هەمیشە لە ناوەوە دروستدەکرێتەوە، واتە لە ڕاستیدا ڕۆحێکی نییە بکرێت لەم جەستەیەوە بیبەین بۆ ئەو جەستەیە، بەڵکو هەمیشە کۆمەڵگاکان بەپێی سروشتی خۆیان دایدەڕێژنەوە، واتە هەر کات دەگاتە لامان ئێمە ڕۆحی خۆمانی دەکەینە بەر.

**پرسیار: ئەی نەبوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی کورد تاچ ڕادەیەک توانیویەتی ببێتە بەربەست لە بەردەم مۆدێرنبوونی ئێمەدا؟**

وەڵام: بەرلەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەمەوە، دەبێت پرسیارێکی گرنگتر و جەوهەری بکەم: ئێمە مەبەستمان لە مۆدێرن بوون بۆ کورد چییە. وەک لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا گووتم، ڕووبەرێکی زۆری ژیانی ئێمە نوێبۆتەوە، واتە ئێمە لەدەرەوەی مۆدێرنەنین، بەڵام بۆ ئەم نوێبوونەوەیە هەستێکی ڕاستەقینەمان بە بەهێزی تێدا ناخولقێنێت؟ ئایا نوقسانییەکە لە پرۆسەی مۆدێرنیزەبووندایە واتە ئایا هێشتا ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی سنووردارە و پێویستیمان بە مۆدێرنیزەکردنی زیاتر هەیە، یاخود ئەوەی لە مۆدێرنەمان وەرگرتووە هێشتا لە ناو فەزایەکی سیاسی و کولتووری و زیهنیدایە وادەکات ئەو شتە وەرگیراوانە

ناکارابن؟ یاخود خودی ئەوەی لە مۆدێرنەمان وەرگرتووە ئەو بەشە کاریگەرەی مۆدێرنە نییە کە بەستەڵەکە ناوەکییەکان بە تەواوەتی بشکێنێت؟. ئەگەر لەوەڵامی پرسیاری پێشووم بڕوانیت دەبینیت کە کێشەکە تەنیا کێشەی بوون و نەبوونی مۆدێرنە نییە، بەڵکو کێشەی شێوەی بەرخورد و پۆلین و ڕیزبەندی و مانابەخشینە بەو ڕەگەزانەی لە مۆدێرنەی خۆرئاواوە وەریاندەگرین، وە کێشەی ئەوەیە ئەو بەشانەی دی لە مۆدێرنە کە نەهاتوون و دێن، چی لەگەڵ خۆیان دەهێنن، واتە پرس و ترسە لە ڕەهەندە نادیارەکەی مۆدێرنە. بۆ ئێمەی ڕۆشنبیران زۆربەی کات کە باس لە مۆدێرنەدەکەین، باس لە بەهێزکردنی دیوە دیموکراس و مرۆدۆست و جیاوازیناس و ئازادی بەخشەکەی ناو ئەم پرۆسەیە دەکەین. پێموایە ئەم تێزەیە کە وادەبینێت بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی ئۆتۆماتیک و خۆبەخۆ مانای سازکردنی فەزا بۆ مۆدێرنە دەگەێنێت هەڵەیەکی گەورەیە. بەڵام بۆئەوەی ئەمە ڕوونبکەمەوە، دەبێت وردتر وەڵامی پرسیاری پێشووبدەمەوە. من لەو باوەڕەدام ئێمە کە باس لە مۆدێرنبوونی هەر کۆمەڵگایەکی دەرەوەی خۆرئاوا دەکەین، مەبەستمان لەوەیە ئەم کۆمەڵگایە بەسوود وەرگرتن لە مۆدێرنەی خۆرئاوا بگاتە ئاستێکی گەشەی ئەوتۆ کە بتوانێت بەبێ گەڕانەوە بۆ مەرجەعی مۆدێرنە کە خۆرئاوایە خۆی پرۆسەی مۆدێرنیزەکردنی خۆی درێژە پێبدات و لە ناوەوەڕا بیخاتەگەڕ. پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەم ئامانجە گرێدراوی دەوڵەتی نەتەوەییە؟. بەبڕوای من دەوڵەتی نەتەوەیی پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن سەنترالیزە دەکات، لەوانەیە فەزایەکی ئارامیشی بۆ بخولقێنێت، بەڵام زیانیشی لێدەدات. کێشەی گەورەی مۆدێرنە لە دونیای ئێمەدا ئەوەیە، هەمیشە لە هەندێک سەنتەر و شار و جێگای بچوکدا دیلدەکرێت، واتە مەسەلەکە ئەوە نییە میللەتێک مۆنۆپۆڵی بکات بۆ خۆی، بەڵکو نوخبەیەکی کۆمەڵایەتی مۆنۆپۆڵیدەکات بۆ

خۆی. من لەو باوەڕەدا نیم پەیوەندییەکی میکانیکی لە نێوان دەوڵەتی نەتەوەیی و مۆدێرنەدا هەبێت، ئێمە بەبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و بێدەوڵەتیش هەر لە ناو مۆدێرنەدا دەژین. بەڵام مۆدێرنە و دەوڵەتی نەتەوەیی دوو هێزن بە پۆزەتیڤ و نەگەتیڤ کار لە یەکدی دەکەن. بۆ نمونە مۆدێرنە ڕوخسارێکی تایبەتی دەبەخشێتە دەوڵەتی نەتەوەیی و دەوڵەتی نەتەوەش چاوەڕوانی تایبەتی لە مۆدێرنە هەیە، بەڵام ئەوەی پێکەوە گرێدرابن و هەر یەکەیان مەرجی ڕەهای ئەوی دی بێت، ئەوا بەو جۆرە نییە. نابێت ئەوەشمان لە یادێت کە ئەم نەخشە سیاسییەی ئێستا لە خۆرهەڵات هەیە بەرهەمی مۆدێرنەیە. لە نەخشەی جوگرافییەوە بۆ ستراکتوری دەوڵەت و ئیدارە هەموو بەرهەمی مۆدێرنەن، بەڵام مۆدێرنەیەک وزە ناوەکییەکانی ناو کۆمەڵگای لەخەو هەڵنەستاندوە. ئەوەی کە هەیە جۆرێکە لە مۆدێرنە لەدەرەوە دەیهێنین بۆئەوەی ڕێگریبکەین لە سەرهەڵدانی مۆدێرنەیەکی نوێ و تایبەت لە ناوەوە، بە چەشنێک وادەکەوێتەوە وەک ئەوەی مۆدێرنەی خۆرئاوا ئیدیالی مۆدێرنەی ناوەکی و لۆکاڵی ئێمەش بێت، بەڵام لە جەوهەردا ئەمە فێڵێکی ناوەکییە بۆ ئەوەی ڕێگا لە مۆدێرنیزەکردنێکی ناوەکی و خودکار بگرین. هێزە کۆنپارێزەکانی ناوچەکە دژی ئەوە نین کە تادەتوانین لە مۆدێرنەی خۆرئاوا شت بخوازین، بەڵام دژی مۆدێرنەیەکی خودکارن کە هێزی ناوەکی نوێ پێشەنگی تێدا بکات. لەو باوەڕەدانیم مەسەلەی دەوڵەتی نەتەوەیی مانای سەرهەڵدانی دۆخێک بێت ئەو هێزە مۆدێرنە خودکارە دەستی ئازادبێت و بکەوێتە گەڕ. واتە مەرج نییە دەوڵەتی نەتەوە بیەوێت پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن نوخبەی کۆمەڵایەتی وەها بخولقێنێت، بکرێت شێوەی ژیان یان پێکهاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی بگۆڕن. زۆر لە قەوارە سیاسییەکانی ناوچەکە مۆدێرنەیان دەوێت بەڵام بەبێ نوخبەی مۆدێرن، مۆدێرنەیان دەوێت بەبێ مرۆڤی

مۆدێرن، مۆدێرنەیان دەوێت، بەبێ ئەوەی کۆمەڵگایەکیان بوێت لە ناوەوەڕا غایەتی مۆدێرنی هەبێت. لەسەرەوە ئامارژەم بە دۆخێک دا کە ناومنا «مۆدێرنەی بەر لە مۆدێرنە» یان «مۆدێرنەی پێش مۆدێرنە» مەبەستم لەمە ئەوەیە کە مۆدێرنە ببێت بە ستراتیژی بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی، ببێت بە ئامانجی یەکەم، واتە ڕێکخستنەوەی ئامێرەکە ببێت بە ئامانجی سەرەکی، بەچەشنێک ماشینەکە بشێت و ببێت کە خۆی خۆی بزوێنێت و شتی نوێ بۆ خۆی دروستبکات و بەعەقڵانی بکەوێتە گەڕ و لەسەرووی هەموو شتێکەوە هۆکاری خولقاندنی ئاشتی کۆمەلایەتی بێت. مۆدێرنەی بەر لە مۆدێرنە واتە ئامادەگی ئەو ڕەگەزەی کە وادەکات هاتنی دەرکەوتەکانی مۆدێرنە سەقامگیری کۆمەلایەتی لە ناوەوە تێک نەدات و کۆمەڵگا هەلاهەلانەکات. بەداخەوە مێژووی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی ناوچەکە لەو ئاست و ئاڕاستەیەدا شتێکی وەها ناسەلمێنێت، کە دەوڵەتی نەتەوە زامنی مۆدێرنە بێت.

لەسەد ساڵی ڕابوردوودا بیرۆکەی سەقامگیرکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی ئامانجی سەرەکی دەوڵەتە خۆرهەلاتییەکان بووە، هەموو کارەساتە گەورەکانی ناوچەکە پەیوەندیان بە مۆراڵی ناسیونالیستی و مۆراڵی دەوڵەتی نەتەوەییەوە هەبووە. لە عێراق و ئێران و تورکیا چەسپاندن و پاراستنی سنوورەکانی دەوڵەت پێش ستراتیژی مۆدێرنکردن کەوتن. ئێمە لە کوردستاندا بەهۆی ئاستی سیاسی و بەهۆی ئەو دابەشبوونە قووڵەی کە دروستبووە ناتوانین ئاسان دەوڵەتی نەتەوەیی دروستبکەین، بەڵام دەتوانین گەمەکە بە تەواوەتی بگۆڕین و مۆدیرنیزەکردن بکەینە ئامانج واتە ئەوە بکەین کە لەم دەقەرەدا ڕوویندەداوە، دیارە ئەمە توانا و قوربانی و زیرەکییەکی بێپایانی دەوێت. بەبڕوای من ئازادبوونی کورد چیتر گرێدراوی ئەوەیە زیاتر و زیاتر ناوچەکە بەرەو ئەوە ببازوین

لە گرێ ناسیونالیستییەکانی ئازادبێت و ڕوو لە چەشنێکی مۆدێرنیزە بکات لەسەر یەکسانی و ئاشتی کۆمەڵایەتی دامەزرابێت. تا ڕۆحی ناسیونالیستی لەم وڵاتانەدا بە کوڵ و گەرم بێت ئێمە ئازاد نابین... ئەو مۆدێرنەیەی لە دونیای دەرەوەی ئێمەدا بەرهەمدێت، پێویستی بە پاسپۆرت نییە بۆئەوەی بگاتە ناوەوە، سنوورەکانی دوڵەتی نەتەوە تا بێت تەنکتر و تەنکتر دەبن، بەجۆرێک ئەو هورووژمە لەدواجاردا بەجۆرێکی حەتمی لە ناوەوەڕا گۆڕانکاری چۆنایەتی گرنگ دروستدەکات. تا ڕۆحی ناسیونالیستی و قودسییەتی دەوڵەتی نەتەوە لاوازبێت ئێمەی کورد باشتر دەتوانین ئازادبین، لێرەوە من چارەسەرییەکە لەوەدا نابینم کە بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوە بەهێزتر بێت و شەڕی ناسیونالیستی توندتربێت بۆئەوەی ئێمە بگەینە ئازادی، من ئاڕاستەکە تەواو بە پێچەوانەوە دەبینم، شانسی ئازادی ئێمە لە کەمبوونەوەی گرنگی و لە لەدەستدانی قودسییەتی دەوڵەتی نەتەوەییدایە. ئێمە لە کوردستانی عێراق بۆ هەژدەساڵ دەچێت قەوارەیەکی سیاسیمان هەیە زۆر لە فۆرمی دەوڵەتەوە نزیکە، بەڵام چیمان کرد؟. ئێستا ئاستی گەشەی ئابووری و کشتوکاڵی و پیشەسازی و ئەخلاقی و زانستی لە چاو هەژدەساڵ لەمەوبەردا لە خوارترە... جگە لەوەی نوخبەیەکی ئەرستۆکرات و لووتبەرز و گوێ نەگر و گەندەڵمان هەیە، خاوەنی هیچ دەرکەوتەیەکی تری مۆدێرنە نین کە مانایەکی ستراتیژی بۆ ئێمە هەبێت. جگە لەوەی ئەم دەسەڵاتە نەزانی و نارێکی بەرهەمدەهێنێت شتێکی گرنگی دیکەی دروست نەکردوە. هەر شتێک کە ئێستا من دەیبینم و لە کوردستاندا جوانە و مانای هەیە، ئەم دەسەڵاتە یان دژایەتیدەکات یاخود دەیەوێت لە مانا خاڵیبکاتەوە. دەوڵەتی نەتەوە کاتێک دەبێتە پاڵپشتی مۆدێرنە کە لەسەر تەسکبیری ناسیونالی و دینی و ئایدۆلۆژی دروست نەبووبێت، لەوە دەرچێت دەبێتە فۆرمێک کە مۆدێرنە وەک کەرەستەی کۆنترۆڵ و

سەرکووتکردن بەکاردەهێنێت... بۆیە لە سەرەتاوە لە گرێدانەوەی نێوان مۆدێرنە و دەوڵەتی نەتەوەیی بەجۆرێکی میکانیکی بە گومانم.

**پرسیار: جگە لە ئاوتابوونی بیری مۆدێرن و بیری نەتەوەیی لەلای کورد، دیاردەیەکی تریش لەگەڵ ئەم دیاردەیە سێ کوچکەیەکیان پێکدەهێنا، کە وێک هەڵکرىنی ئەم سێ لایەنە تا ئەم دواییانە هەر بەردەوام بوو، لایەنی سێیەم بریتی بوو لە ئایدۆلۆژیای سوسیالیزم، دەکرێت بڵێین لە چلەکان بەدواوە تا نیوسەدە، هەموو بزوتنەوە میللییەکان لە کوردستان ڕەنگی سوسیالیستیان پێوەبوو، ڕوناکبیرێکی ئێرانی بە ناوی «عەلی میر سپاسی» کە مامۆستای زانستگاکانی ئەمریکایە دەڵێ یەکێک لە هۆیەکانی شکستی مۆدێرنیتەی ئێرانی ئەوەبوو کە بزوتنەوەی چەپ لە ئێراندا شکستی هێنا، ئەگەر ئەو بزوتنەوەیە سەری گرتبا، ئەگەری سەرهەڵدانی مۆدێرنیتەیەکی توندوتۆڵتریش لە ئێرندا لە ئارادا بوو. ئایا دەتوانین هەمان قسە بۆ بزوتنەوەی چەپی کوردیش بکەین، بەدەربڕینێکی دیکە ئایا دەتوانین بڵێین ئەگەر بزوتنەوەی چەپی کوردی سەرکەوتبا، خۆری مدێرنیتەی کوردی بۆی هەبوو لە ئاسۆی ڕوانین و جیهانبینییەکی چەپدا هەڵبێت؟**

وەڵام: دیارە وەک لەسەرەوە ئامـاژەم پێدا مـن چیتـر ترادسیۆنگەرایی لەدەرەوەی خـودی مۆدێرنە نابینم. مۆدێرنە بۆتە ئامـاژەیەکی بەتاڵ کە دەکرێت بـە مانـای جیـاواز پڕیبکەینەوە، لایەنیکەم لە ئاستی سیاسیدا ناتوانین قسـە لە چەمکێکی مۆدێرنەی گشتی بکەین. مۆدێرنە بەپێی ڕێکخستنی ڕەگەزەکانی مانای دەگۆڕێت بێتەوەی لەوە بکەوێت کە مۆدێرنە بێت. ئێستا ئێمە ناتوانین بەجێگایەکی وەک دوبەی بڵێین مۆدێرن نییە، بەڵام ئەم مۆدێرنەیە جودایە لە مۆدێرنە لە شارێکی

وەک شەنگەهای یاخود لۆس ئەنجلس... مۆدێرنەی شێخەکانی عەرەب جودایە لە مۆدێرنەی کۆمۆنیستەکانی چین و جودایە لە خواستی مۆدێرنە لە ئیسرائیل یاخود لە خواستی مۆدێرنە لە ئێران. مۆدێرنە چێوەیەکی گشتییە، فۆرمێکی دیاریکراو و شێوەیەکی دیاریکراوی هەیە، بێئەوەی جەوهەرێکی سیاسی یەکگرتووی هەبێت. کێشەی ئێمە ئەوەیە کە زۆرجار مۆدێرنە لە یەک ئایدۆلۆژیای سیاسی موتوربەدەکەین و پێمانوایە ئەم ئایدۆلۆژیا یاخود ئەوی دی هەڵگری جەوهەری مۆدێرنەیە. ئێمە دەبێت بزانن هەر کات بەرگری لە مۆدێرنە دەکەین، بەرگری لە تەنیا مانایەکی مۆدێرنە دەکەین، کە مەرج نییە گەر ئەو مانایەمان چنگ نەکەوت ئیدی مۆدێرنە بوونی نەبێت. هەڵوێستی ئێمە لە مۆدێرنە هەمیشە هەڵوێستێکی ئایدۆلۆژییە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە خودی پرۆسەی مۆدێرنە دەتوانێت ئەو خەونە ئایدۆلۆژییە تا کۆتایی جێبەجێبکات، چونکە مۆدێرنە شانۆی بەیەکدادانی هەموو خەونە ئایدۆلۆژییەکانە. مۆدێرنە لەسەرەتا ئەورووپی و فۆرمە خۆرئاواییەکەیدا بەرهەمی لێکدانی گەشەی زانستە بە گەورەبوونی شوێنی فەرد و بەرز نرخاندنی ئازادی سیاسی مرۆڤ، لەهەندێک وڵات و هەندێک کولتووری دیدا هەوڵی کورتکردنەوە و شێواندن و ترازادنی ئەو ئەڵقە بنەڕەتیانە دەدرێت کە مۆدێرنەیان لێدروست بووە، بۆ نمونە دەبینین وڵاتێک دەیەوێت بۆمبی ئەتۆم دروستبکات بەڵام چاپکردنی وێنەکانی مۆدلیانی یان کەتەلۆگێکی ڕینوار یان نیشاندانی فلیمێکی سینەمایی بە تەواوەتی تێیدا نامومکینە. لە دوبەی مرۆڤ دەتوانێت بە ڕوکەش هەموو دەرکەوتە و دیاردەکانی دونیای مۆدێرن ببینێت، بەڵام وەرگێڕانی کتێبێکی مارکیز دی ساد بە عەرەبی و خوێندنەوەی لەلایەن کچێک یان ژنێکی خەلیجییەوە لە تابۆ هەرە گەورە و حەرامە هەرە ناشایستەکانە. بە مانایەکی تر هەموو مۆدێرنین بەڵام هەر یەکەمان بە ڕێگای خۆی،

هەیە گەشەی زانستی بە سەنتەری مۆدێرنە دادەنێت و دەیەوێت پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن لەویادا گەمارۆبدات، هەیە گەشەی ئابووری دەکات بە سەنتەر، هەیە بەوەوە دەگیرسێتەوە کە تەنیا فۆرمی سیاسی مۆدێرن، دیموکراسییەتی پەرلەمانی و ئاڵوگۆڕی ئازادی دەسەڵات بە جەوهەری مۆدێرنە بزانێت و لەویادا دەوەستێت، هەشە بازاڕ و دوکان و ماشێن و کاڵاکانی مۆدێرنەی بەسە، بۆ ئێمە نوسەرانیش پێوەری مۆدێرنە ئازادی مرۆڤ، ئازادی دەربڕین و ڕێزی فەردانییەت تاک و ڕەخساندنی هەلی یەکسان بۆ مرۆڤەکان و گەشەی زەوقی ئەدەبی و هونەرییە.

گەر لێرەوە بگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەی بەڕێزتان دەڵێم: ڕاستە لە سەدەی بیستدا گووتاری مۆدێرنە لای ئێمە فۆرمێکی سوسیالیستی هەبوو. سوسیالیزم لە ئاستی تیوریدا وەک سندوقێک وەهابوو کە هەموو چارەسەرەکانی تێدایە، دەیتوانی وەعدی ئازادی سیاسی و ئازادی ئابووری و گەشەی تەکنیکی بدات بە کۆمەڵگا. سوسیالیزم لە کۆمەڵگای ئێمەدا مۆدێرنە بوو لە دیوە خورافی و ئەفسانەییەکەیدا، مۆدێرنە کاتێک رووە ناشیرینەکەی خۆی دەشارێتەوە و خۆی وەک مەخلوقێکی یەک دیو و یەک سەر و یەک دەموچاو پیشاندەدات. پرۆژەی سوسیالیستی تەنیا لە ئێراندا نوشوستی نەهێنا، بەڵکو بە هۆی ئەم دیوە خورافییەوە لەسەرتاسەری دونیادا هەرەسیهێنا. سوسیالیزم تاکە خەونێکی دەستەجەمعی و کۆگیری بەشەرییەت بوو، کە ئاسەواری لەسەر هەموو کۆمەڵگا جیاوازەکان بەجێهێشت. من لەو باوەڕەدانیم سوسیالیزم بیتوانیبایە لە ئێراندا موعجیزەیەک تۆماربکات کە لە جێگاکانی تردا نەیتوانیوە، سوسیالیزم نە لە ئاستی گەشەی تەکنیکی، نە لە ئاستی گێڕانەوەی عەدالەت بۆ کۆمەڵگا، نە لە ئاستی بەعەقلانیکردنی دەسەڵات، نە لە ئاستی گەورەکردنی ئازادییەکانی

مرۆڤـدا مۆدێلێکـی سـەرکەوتووی نەخولقانـد، بـە پێچەوانـەوە نوخبـەی دەسـەڵاتداری زۆر کوێـر و دەوڵەتـی پۆلیسـی زۆر ترسـناکی دروسـتکرد. دیارە هۆی نوشوستییەکە گەلێـک زۆرە و زۆر زۆریـش قسـەی لەسـەرکراوە. بـەڵام لـە هەمـوو هـۆکان گەورەتـر، بەبـڕوای مـن ئەوەیـە بتەوێـت گەشـەی تەکنیـک هاوشـان بـە دەوڵەتێکـی سـەنترال و ئابوورییەکـی سـەنترال و فەزایەکـی یـەک ڕەنـگ پیادەبکەیت. سوسیالیزم لـەوەدا کـەوت کـە هەوڵیـدا هەمـوو کۆمەڵـگا وەک یەکـەی یـەک ڕەنـگ سـەیربکات، یەکسـانی ئابـووری وەرگێڕایـە سـەر پـڕۆژەی دروسـتکردنی کۆمەڵگایەکـی ئایدۆلـۆژی یـەک ڕەنـگ، کـە یەکسـانی ئابـووری بەشـەرەکان دەیکـردە یەکسـانی فیکـری و سیاسـی و ئەخلاقیشـیان، ئەمـە لـە تەفسـیری میکانیکـی ئـەو تێـزە مارکسـییەوە سـەرچاوەی دەگـرت کـە دەڵێـت. «هەلومەرجـی مـادی، هوشـیاری ئادەمیـزادەکان دەستنیشـاندەکات» . مـن وادەبینـم کـە ڕۆحـی یەکسـانی لـە جەوهـەری پـڕۆژەی مۆدێرنەدایـە، بـەڵام یەکسـانی تەنیـا لـە ڕێگای داننـان بـە جیاوازیدا بەرقـەرار دەبێـت نـەوەک لـە ڕێـگای سـڕینەوە و هەڵگرتنـی جیاوازییـەوە وەک لـە سوسـیالیزمدا بینیمـان. مـن پێموانییـە گـەر چەپـی ئێرانـی یاخـود کـوردی سـەرکەوتبان، شـتێکی جیاوازتریـان کردبـا لـەوەی کـە لـە جێگاکانـی دیکـە کـرا. گـەر چەپـی ئێرانـی سـەرکەوتبا ئێـران ئێسـتا ڕوویەکـی دیکـەی نەدەبـوو، دەوڵەتێـک دەبـوو لـە باشـترین حاڵەتـدا لـە جـۆری کۆریـای باکـوور، یـان لـە چەشـنی کوبـا، لـە خراپتریـن حاڵەتیشـدا جێگایـەک دەبـوو وەک ئەفغانسـتان دوای هەرەسـی چەپـی ئەفغانـی... ئەزموونـی چـەپ ئەوەنـدەی دیکتاتـۆری دروسـتکردوە، ڕێگایـەک نەبـووە بـۆ کەمکردنـەوەی ڕووە ترسـناکەکانی مۆدێرنـە... ئیـدی بـە ڕاسـتی نازانـم لەسـەر بنەمـای چ جـۆرە تێگەیشـتنێکی مێژوویـی و مەوزوعـی دەتوانیـن ئـەو دەرەنجامگیرییـە بکەیـن و بڵێیـن چەپـی ئێرانـی دەیتوانـی پـڕۆژەی مۆدێرنـە لـە ئێرانـدا سـەربخات. مـن خـۆم لـەو بـاوەڕەدا نیـم کـە

سەرمایەداری سیستەمێکی ئەبەدی بێت، یاخود سیستەمێک بێت قابیلی هەرەس نەبێت، بەڵام بێگومان سوسیالیزم بەو فۆرمە سیاسییەی کە تا ئێستا چەپەکان بانگەشەی بۆدەکەن هێندەی سەرمایەداری و سیستەم بەهێزدەکات، لاوازی ناکات. ئێستا سەرەتای ڕەخنە لە کەپیتالیزم و لە ڕووە تاریکەکەی مۆدێرنە بەشێکی بە ناو خودی ڕەخنە لە سوسیالیزمدا دەڕوات. من ناتوانم ڕەخنە لە سوسیالیزم لە ڕەخنە لە کەپیتالیزم و لە ڕەخنە لە ڕووە تاریک و ڕەشەکەی مۆدێرنە جیابکەمەوە. سوسیالیزم هیچ نەبوو جگە لە کەپیتالیزم لە فۆرمە هەرە پریمیتیڤ و دەسەڵاتخواز و تۆتالیتارەکەیدا، کەپیتالیزم بەوجۆرەی کەدەکرا لە کۆمەڵگا کشتیاری و بێگەشەکاندا دەربکەوێت. لە هەر جێگایەک سوسیالیزم سەرکەوتووە، مۆدێرنە لە بری ئەوەی ڕووە بە ڕەحم و هیومانیستی و لێبوردەکەی دەربخات، ڕووە دڕندە و پۆلیسی و بەندەپەرستەکەی دەرخستووە.

**پرسیار: جەنابتان لە وتووێژێکدا بە ناوی دەربارەی ناسیونالیزم و دیموکراسییەت کە لە کتێبی خوێنەری کوشندەدا بڵاوبۆتەوە، شانسی سەرکەوتنی بزووتنەوەی ناسیونالی کوردی لەوەدا دەبینن کە بکرێ ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ تێفکرینی لیبرالیزمدا لێک گرێ بدرێن. ئەگەر لە مانای ڕاڵەتیی وشەی لیبرالیزم کە ئازادیخوازییە بترازێین. لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو ئایدۆلۆژیای لیبرالیزم و سوسیالیزمدا بە شێوەیەکی مێژوویی سەلمێندراوە کە سوسیالیزم هەڵگری هەڵوێستی گۆڕانخوازی و دەنگ هەڵبڕینە دژی هەر چەشنە بێعەدالەتییەکە، لە بێ عەدالەتی جینایەتی و ئابوورییەوە بگرە هەتا نایەکسانی نەتەوایەتی. بەڵام لیبرالیزم لەگەڵ نیزامی سەرمایەداری جیهانیدا لێکگرێ دراون زیاتر هەڵگری هەڵوێستی کۆنسرەڤاتیسم و ڕازی بوونە بە وەزعی مەوجود. لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە بزووتنەوەی کوردی کە لە زاتی خۆیدا ڕەخنەگرێکی**

**ڕادیکالی هاوکێشە سیاسییەکانی نێونەتەوەیی و ناوچەیی لە پەیوەند لەگەڵ کێشەی کوردە، چۆن دەتوانێ هەڵوێستێکی کۆنسێرڤاتیستانە ڕەچاو بکات؟**

وەڵام: بەبڕوای من بەشێکی وەڵامەکە لە خودی چاوپێکەوتنەکەی پێشوودا هەیە. لێرەدا هەوڵدەدەم لە پاڵ ڕوونکردنەوەی ئەو خاڵانەی ناو ئەو چاوپێکەوتنە هەندێک شتی نوێش بڵێم. سەرەتا من باس لە «فیکری لیبرال» واتە «فیکرێک کە لەسەر ستایشکردنی ئازادی مرۆڤ و ڕێزگرتنی ئەو ئازادییە ئیشدەکات» قسەدەکەم، نەوەک لەسەر گرێدانەوەی ناسیونالیزم بە لیبرالیزمەوە... ئەمە دوو شتی تەواو جیاواز و لەیەک دوورن. «فیکری لیبرال» کاتاگۆرییەکە لە ژێریدا ژمارەیەکی زۆر بیریار و بۆچوون و تێز خۆی دەبینێتە، بەڵام لیبرالیزم لە ئێستادا «ئایدۆلۆژیایەکی حوکمکردنە»، وەک ئەوەی لە هەندێ حیزبی خۆرئاواییدا هەیە. لەگەڵ فیکری لیبرالدا من باس لە چوارچێوەیەکی نرخ و بەها دەکەم کە بۆ پاراستنی لایەنیکەمی کەرامەتی مرۆڤ گرنگە، نەوەک باس لە لیبرالیزم بکەم، وەک ئایدۆلۆژیای ئازادکردنی ڕەهای بازاڕ، کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر کایەی ئابووریدا، گۆڕینی میدیا بۆ کەرەستەی کۆنترۆڵکردنی بیرکردنەوە، بەجێهێشتنی مرۆڤ لە گۆڕەپانی ململانێیەکی کراوەدا کە تێیدا بەهێز دەتوانێت لاواز تێکبشکێنێت.

لە هەموو حاڵەتەکاندا وەک لە چاوپێکەوتنەکەی پێشووشدا ئاماژەم پێدا، سەرمایەداری خۆرهەڵاتی ناتوانێت لیبرال بێت، دروشمەکانی ئازادی تاکەکەس و تێکشکاندنی کۆتەکانی سەر دەست و پێی فەرد، سەر عەقڵ و سەر ئازادی بیرکردنەوە، سەر هەڵبژاردنی ئازاد، لە کۆمەڵگای ئێمەدا هێشتا دروشمی شۆڕشگێڕانە و ڕادیکالن. لە ڕۆژئاوا دیموکراسییەت و

سەرمایەداری هاوڕێی یەکدی بوون، دیارە ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەم هاوڕێتییە ئەبەدی و هەمیشەیی بووە، یاخود تووشی گێژاوی گەورە نەبووە و نابێت، شەڕی دیموکراسییەت لە هەناوی خۆرئاواشدا هەر شەڕێکی ڕۆژانە و بەردەوامە. بەڵام لە خۆرهەڵاتدا ئەو سیستەمە کولتووری و سەربازی و ئیداری و سیاسییەی سەرمایەداری شانی دادەداتە سەر، ناتوانێت ئاسان گەمەی ڕاستەقینەی دیموکراسییەت قەبووڵبکات. فیکری لیبرال لای من کورتکردنەوەیەکی مەجازییە بۆ کۆی ئەو جیهانبینی و داواکاریانەی کە بەرگری لە دیموکراسییەت و مافی گروپەکان و مافی تاکەکان دەکەن. باوەڕناکەم لە خۆرهەڵاتی ئێمەدا دیموکراسییەت و مافی تاک و گروپەکان بەشێک بن لەوەزعی مەوجود وەک بەرێزتان دەڵێن. شوبهاندنی ئەرکەکانی فیکری لیبرال لای ئێمە بە ئایدۆلۆژیای لیبرالیزمی نوێ کە لە ئەمریکا بانگەشەی ئەبەدییەتی سەرمایەداری و ململانێی بێچاودێری و جیهانگەراییەکی شەڕانگێز دەکات، نەوەک هەڵەیە، بەڵکو پێشکەشکردنی زەمینەیەکی گرنگە بۆ دیکتاتۆرەکان بەردەوامبن لە پێشێلکردنی ئەم مافانەدا. فیکری لیبرال لە دونیای ئێمەدا قورساییەکی گەورەی هەیە بۆ ئاشکراکردنی ئەو کۆتانەی کۆمەڵگا بۆ فەردی دروستدەکات، کۆنزەرڤاتیزمی ڕاستەقینە بە بڕوای من، ئەوەیە لە دونیایەکدا بژین، فەرد قەڵایەک و فیکرێکی نەبێت لە سیاسەت و مۆراڵ و ئایدۆلۆژیا دەستەجەمعییەکان بیپارێزێت. هەڵبەت فیکری لیبرال وەک سوسیالیزم کۆمەڵێک ڕەهەندی یونیفرسالی تێدایە کە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا گرنگ و زیندوو دەمێننەوە، وەک چۆن خواستی مرۆڤ بۆ یەکسانی و عەدالەت خواستێکی بان ـ کولتوورییە، خواستی تاک و گروپەکانیش لە هەموو کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا بۆ ئازادی ڕەهەندێکی یونیفرسالی تێدایە، بەڵام ئەم ڕەهەندە یونیفرسالە کە خۆی لە چوارچێوەیەکی ئایدۆلۆژیدا دەبینێتەوە، دەبێتە هەڵگری تەفسیری جیاواز

جیاواز. بۆ نمونە چەمکی عەدالەتی جیهانی لە پشت ئەوەوە بوو کە زۆربەی چەپەکانی دونیا ببنە لایەنگری سەدام حوسەین، ئاخۆ دەبێت چ شتێک لە دونیادا لە لایەنگریکردنی سەدام حوسەین کۆنزەرڤاتیڤ تر بێت. ئەم دەردە ئایدۆلۆژییە هەڵبەت لیبراڵەکانیش دەگرێتەوە و ئەوانیش خاڵی نین لەم هەڵە ترسناکانە، زۆر لە لیبرال و دیموکراسەکان زۆرجار کوێرانە بەرگری لە کارو کرداری دەوڵەتی ئیسرائیل دەکەن... کێشەکە لە ئایدیای ئازادی یان ئایدیای سوسیالیزمدا نییە، بەڵکو لەوەدایە کە هیچ فیکرێک لە مێژوودا ناتوانێت بە چەشنە ئیدیال و پاکەکەی دەربکەوێت، هەر هێندەی بووە ئایدۆلۆژیا دەبێت بەرگری لە شتێک بکات و شتێکی دی بکاتە دەرەوە. ئەوەی کە گرنگە ئەوە نییە واز لە بیرۆکەکە بهێنین، واز لە خەیاڵی یەکسانی و ئازادی و ماف بهێنین، بەڵکو ئەم نرخانە لەوە بپارێزین لە چوارچێوە ئایدۆلۆژیاکاندا بەها و کار و کرداری خۆیان بدۆڕێنن. هەمیشە لە نێوان مانای فیکری و ئەخلاقی بەهاکان و مانای ئایدۆلۆژیاندا جیاوازی و ململانێ هەیە. ئێمە هیچ کات ناتوانین هیچ بیرۆکەیەک و بەهایەک لەوە بپارێزین ببێتە ئایدۆلۆژیا، تێپەڕین بە تونێلی ئایدۆلۆژیادا قەدەری هەموو فیکرێکە کە لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگا ئیشبکات. بەڵام گرنگە لە هەوڵێکی بێوچاندا بین نەهێڵین هیچ ئایدۆلۆژیایەک، هیچ هێزێک خۆی بەتەنیا بە خاوەنی ئەو بەهایانە بزانێت. نە دیموکراسییەت موڵکی ئایدۆلۆژیستە لیبراڵەکان و نە دژایەتی چەوساندنەوە موڵکی کۆمۆنیستەکانە. هەمیشە هێزێک دێت دەیەوێت ئەم نرخانە بۆ قازانجی سیاسی بەکاربهێنێت، بۆ ئێمە گرنگە هەوڵبدەین کە یەکەم: ئایدۆلۆژیاکان بە جۆرێک بە باری ئەو بەهایانە قورسبکەین، ئاسان نەبێت خیانەتیان لێبکرێت و بشێوێنرێن و بکرێنە بەهای سەتحی و فۆرمال. دووەم: دەبێتە ئەو بەهایانە هەمیشەش لەدەرەوەی ئایدۆلۆژیاکان، لە جیهانی فیکر و هونەر و ئەدەبدا پاسەوان و

بەرگریکەر و پارێزەریان هەبێت. واتە کە باس لە فیکری لیبرال دەکەم لەدەرەوەی هەر تێزێکی ئایدۆلۆژی لێیدەڕوانم، یاخود ڕووی قسەم لەو ڕەهەندانەی فیکری لیبرالە کە سنووری هەموو ئایدۆلۆژیایەک تێدەپەڕێنن و وەک ئەو نرخە دەردەکەون کە مافی هەموومانە هەڵگر و پارێزەری بین. ترسناکترین شتێک بۆ ئازادی یان دیموکراسی یان یەکسانی یان عەدالەت ئەوەیە وابکەوێتەوە کە موڵکی هێزێک و بەرەیەکە و بە تەنیا ئەوان دەتوانن ماناکەی دیاریبکەن... دیموکراسییەت ئەوەیە لە کۆمەڵگایەکدا بژین هەتا خودی دیموکراسییەت هەڵگری زیاد لە مانایەک بێت، ئازادیش ئەوەیە کە هەتا خودی ئازادیش هەڵگری زیاد لە فۆرم و شوناسێک بێت. لێرەوە کە باس لە پەیوەندی فیکری ناسیونالی لەگەڵ فیکری لیبرالدا دەکەم، باس لەوە دەکەم فیکرێکی ناسیونالیمان نەبێت بەسەر هەندێ دۆگمادا داخرابێت، بەڵکو فیکرێکی ناسیونالیمان هەبێت بەسەر زیاد لە ئەگەرێکی مانا و ئەگەرێکی شوناسدا کرابێتەوە.